



# ئەو وتانەی ژیانمان دەگۆڕن

ئامادەکردنی: سەردار سووسەیی





خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

- ئەو ڕێگایانەی ژیانمان دەگۆڕن
- ئامادەکردنی: [illegible]
- نەخشەسازیی ناوەوە: ڕێبوار جەعفەر
- بەرگ: ڕێبوار
- نرخ: ٤٠٠٠ دینار
- چاپی یەکەم: ٢٠١٤
- تیراژ: ٧٥٠ دانە
- چاپخانەی موکریانی (هەولێر)
- لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٣٣٢) ساڵی (٢٠١٤) [illegible]

زنجیرەی کتێب (٨٤٠)

MUKIRYANI

ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani

# بە ناوی خوای گەورەی میهرەبان

## لە باتی پێشەکی

شێوەی ژیان و ئامانجی هەموو تاکێکی کۆمەڵگە لە یەکدیی جیاوازە، لەم نێوەندەشدا زانایان و ناوداران و هزرڤانانی مەزن لە بوارە جیاجیاکانی زانستی، ئاینی، مێژوویی، سیاسی، هونەری، ئەدەبی وتەی درەوشاوە و پرشنگداریان بۆ مرۆڤایەتی تۆمار کردووە، کە بە رامان و تێڕوانینێکی خێرا بۆمان دەردەکەوێت لە رێڕەوی گەیشتن بە ئامانجەکانمان رۆڵی گرینگ و پڕ بایەخیان هەیە، بۆیە ئەم وتە نایاب و ناوازانە روانینمان سەبارەت بە ژیان، بوون و کۆمەڵگە دەگۆڕێت و کاریگەرییەکی مەزنیش لە ژیانی هەر تاکێك دادەنێن. لە دنیای ئەمڕۆدا شێواز و چۆنییەتی دەربڕینی وشەکان، ئاستی رۆشنبیری تاکەکان دیار دەخات، هەر بۆیە پێویستمان بەم وتە درەوشاوانە هەیە تاوەکو سەرەڕای بەخشینی جوانی، کاریگەرتر بێت و لە هزری گوێگر بچەسپێت. وتە نووسراو و زارەکییەکان سنوور و مەودا و ساڵەکان دەبڕن هەر کاتێك بمانەوێت لەسەر بابەتێك یاخۆ کایەیەك بدوێین وتەیەکی جوان دەکەینە پاڵپشت، ئەگەر بابەتێکی لۆژیکی و عەقڵانی بێت وتەی

فەیلەسووفان یاخۆ هزرڤانان دەهێنینــەوە تــاوەکو کاریگــەری زیــاتری هــەبێت. لــە ئەدەبیشدا کۆمەڵێك کورتــە هــۆنراوە هــەن، کــە وێــڕای ئێســتێتیکی ئــەو چــێژ و جوانییەی پێمان دەبەخشن، پڕن لە واتای نیاب و پڕ بەها. بەڵام هەروەك دەزانین بــە هۆی سەرقاڵی مرۆڤی ئەمڕۆ کات و توانای ئەوە نەماوە ســەرجەم ئــەو بەرهەمانــە بخوێندرێنەوە و جاری واش هەیە خوێنەر تووشی بێزاری دەکات و سەرەڕای ئەمــەش بەهۆی جیاوازی زمانی بەرهەمەکان تێگەیشــتنیان دژواردەبــێ، لــەم کتێبــەدا بــە هەندوەرگرتنی ئەو بابەتانە و گرینگی بە کات و هــزری مرۆڤــەکان، هــەوڵ دراوە وتە پڕ واتا و کاریگەرەکانی ئەستێرە درەوشاوەکانی بوارە جیاکان کۆبکرێتــەوە و لە دوو توێی کتێبێکدا چاپ بکرێت، کە وێڕای پوختی و کورتی وتەکان ســەرجەم لایەنەکانی ژیان لەخۆ بگرێت و وەك خۆی بگاتە دەستی خوێنەر. ئەگەرچی پێشتر کۆمەڵێك کتێبی وتەی ناوداران چاپ کراون، بەڵام کرچ و کاڵی و نا روونــی زۆری تێدا بەدی دەکرێت، هەروەك دەزانین هیچ بەرهەمێك نییە لــە کــەموکوڕی بــەدەر بێت، هیوادارین ئەم هەوڵە ببێتە سەرەتایەکی ئەرێنی بۆ بەرهــەمی بــە پێزتــر و دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی و ئاشنا بــوونی خوێنــەری کــورد بــە هــزری گەورە هزرڤانان و ناودارانی جیهان.

## پیتی (أ)

**(ئەلبێر کامۆ) فەیلەسووف و نووسەر و ڕۆژنامەنووسی فەرەنسا**

- ئەگەر نەکرێ ئازادی و یەکسانی، پێکەوە بن و من ناچار بم لەنێوان ئەم دووانە یەکیان هەڵبژێرم، ئازادی هەڵدەبژێرم بۆ ئەوەی بتوانم بە ئازادی ڕەخنە لە نایەکسانی بگرم.

*****

- سامانی نیشتمان چییە بریتییە لە: پڕکردنی، گیرفانی ئاغاکان و، پووچکردنی مێشکیان.

*****

- داهاتوو بۆ کەسانێکە، کە تەنانەت لە تەنیاییشدا، لەگەڵ ویژدانیان درۆ ناکەن.

*****

- لە تایبەتمەندییەکانی سەردەمی ئێمە، کەسانێکی هیچ و پووچ خاوەن بڕیار و کارن.

*****

- برادەران، باوەڕ بکەن لەم جیهانەی ئێمەدا هیچ شتێك لەو شتە بێ نرختر نییە، کە مردن لە شتێك دەست بکێشێتەوە کە لە ناخی دڵیشەوە خۆشی بوویێت.

*****

- هەندێ جار ئامادەم هەموو شتێکی ژیانم، کە هەمە بیبەخشم، بەو مەرجەی پێوەندییم بە مرۆڤەکانەوە نەمێنێت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- کاتێك نهێنی لە لای ئافرەتێك دەدرکێنی، یانی ئەوەی درکاندت نهێنی نەبووە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- کەسێك کە متمانە و باوەڕی بە خۆی هەبێت، هیچ پێویستی بە ستایشی کەسانی دی نییە.
- هەموو بیرکردنەوە و کردەوە مەزنەکان سەرەتایەکی گاڵتەجاڕیان هەیە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ئەو مرۆڤەی بە تەنیا بەختەوەری بۆ خۆی بووێت، مایەی شەرمەزارییە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- کەسی سیاسیی بەپێی ئەوەی کە ڕەوشتی نییە، هیچ لەبارەی ڕەوشتمەندییەوە نازانێت، وەك چۆن مرۆڤی خاوەن ڕەوشت لەبارەی سیاسەتەوە نەزانە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- جاری وا هەیە خۆشترین مژدە لە دژوارترین کاتدا دەگاتە مرۆڤ.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

• ئێمە لە پێناو زۆر شتدا ڕۆژانە دەمرین، کە من پێموایــە هــیچ شــتێك شایەنی ئەوە نییە، لە پێناویدا بمرین، چونکە خۆی ئەو ژیانە ئەوەی نــەهێنا، کــە بۆی ژیاین.

❊❊❊❊❊

• لە زۆر کاتدا ژیان بەسەربردن زۆر زیاتر لە خۆکوشتن، بوێری و جوامێری پێویستە.

❊❊❊❊❊

• ناخۆشــترین شــت بــۆ مــن لــە زینــدانــدا ئــەوە بــوو، بیرکردنــەوەم وەك بیرکردنەوەی مرۆڤیکی ئازاد بوو، بۆ نموونە حەزم دەکرد بچمە کەنار دەریا.

❊❊❊❊❊

• هەمیشە ئەو ڕۆژە هەیە، کە کامە کەس دۆستی نێزیکــت بــووە، لێــت دەبێتە بێگانە.

❊❊❊❊❊

• لەو ڕێز و شکۆیە بێ واتاتر و ناشرینتر نییە، کە لە ترسەوە سەرچــاوەی گرتبێت.

• ئایا لە دنیای ئەمڕۆدا گەشــبینی و ئاســوودەیی بــۆ خــۆی گاڵتــەجاڕی نییە ؟!..

❊❊❊❊❊

- باشترین کارێك ئەوەیە، کە هەموو شتەکانی ژیان ئاسان بکرێت، بە شێوەیەك تەنانەت منداڵێکیش لێی تێبگات، مرۆڤ لەبەرئەوەی توانای چارەسەرکردنی ئازارەکانی نەماوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- هیچ کەسێك و هیچ هونەرمەندێك ناتوانێت چاوپۆشی لە ڕاستی بکات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- لەو تاقمە ماستاوچییە سووك و هیچ و پووچتر نییە، کە هەموو نەنگییەکانی دەسەڵات دەبینن، کەچی هەر چەپڵەی بۆ لێ دەدەن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- لە کاتێکدا هەمووان بێدەنگیان هەڵبژاردووە و قسە ناکەن، من بۆ ئەوەی فێری بێدەنگی نەبم بەبێ هۆکار هاوار دەکەم، کەواتە من یاخیم!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- زۆرێك لە بێدەنگەکان قسەگەلێکی زۆریان هەیە بۆ وتن، بەڵام کەسانێکی گونجاویان نەدۆزیوەتەوە تا گوێبیستیان بن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- خووگرتن بە (بێ هیوا بوون) زۆر خراپترە لە (بێ هیوایی).

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ئەوە خەبات نییە دەمانکات بە هونەرمەند، ئەوە هونەرە دەمانکات بە خەباتگێڕ.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- شتێك کە بێزارم دەکات مرۆڤ بەو هەموو ناشیرنییەی خۆیەوە چۆن لە ڕووی دێت لوتبەرز بێت، کە سەرچاوەی هەموو بەدبەختی و نەهامەتییەکانە.

❊❊❊❊❊

- ناتوانین ژیانمان خۆش بوویت، ئەگەر لیی بێئومێد نەبین.

❊❊❊❊❊

- وتنی (بەڵێ) بۆ هەموو شتەکان، واتای وتنی (بەڵێ)یە بۆ کۆشتنیش، سەرەڕای ئەوەی، کە ئەمە دوو جۆر پاساو بە کوشتن دەدات، ئەگەر کۆیلە بۆ هەموو شتێك بڵێت (بەڵێ )، کەواتە هەم بە بوونی کۆیلەدارەکەی و هەم بە بوونی ئازارەکانی خۆیشی قایلە..

❊❊❊❊❊

- ئەگەرچی دنیا بێ بەزەییە، بەڵام مرۆڤ نابێت بێ بەزەیی بێت.

❊❊❊❊❊

- سەرچاوەی هەموو نەهامەتییەکانی مرۆڤ ئەوەیە، کە بە زمانێکی ڕوون و ڕەوان قسە ناکەن.

❊❊❊❊❊

- مرۆڤی یاخی داکۆکیی لە چەند بەهایەك دەکات، کە چەند بە هایەکی تاکە کەسین، هێندەش بەهای گشتیین، هەر لێرەشەوە دروشمی یاخیبوونەکەی دەبێتە من یاخی دەبم کەواتە ئێمە هەین.

❋❋❋❋❋

- تاکگەرایی جێی باوەڕی گرتۆتەوە، ئەقڵیش جێی ئینجیل، سیاسەت جێی ئاین و کڵێسا، زەوی جێی ئاسمان، کار جێی نوێژ، بەدبەختی جێی دۆزەخ و مرۆڤیش جێی مەسیح.

❋❋❋❋❋

- ئەو شتەی کە من دەمەوێ بیڵێم، تەنانەت ئەو کەسانەش تێی دەگەن، کە وەك من دەرچووی قوتابخانەی هەژاری بن.

❋❋❋❋❋

- لە ڕێگەی تێپەڕبوونم بە ژیاندا فێری ئەوە بووم، کە ئەو کەسانەی زۆرتر خۆشم ویستن، زووتر لە دەستم دان.

❋❋❋❋❋

- ئەگەر پێڵاوەکانت لە پێت داکەنران و لە ترسی قسەی خەڵك هەڵت نەگرتەوە و بەرگەی ئازاری قاچت گرت، ئیدی لەبارەی ئازادییەوە دروشم مەدە.

❋❋❋❋❋

- بێبەشکردنی مرۆڤ لە شتێك جۆرێکە لە سزادا.

❋❋❋❋❋

- لە پشتمەوە مەڕۆ من نامەوێ ببم بە ڕابەرت، لە پێشمەوە مەڕۆ، بە دوات ناکەوم، لە تەنیشتمەوە بڕۆ ببە هاوڕێم.

- بۆ ئەوەی هەموو مرۆڤەکان بە یەکگرتووی پێکەوە بژین، پێویستە نەخۆشی تاعوون بڵاو بکەینەوە.

* * * * *

- کەسانی گەمژە شێتەکان بەبێ ئەقڵ دەزانن، لە کاتێکدا شێتەکان لە دەست گەمژەیی ئەوان بەرەو ئەو جیهانە ڕۆیشتوون، کە مرۆڤ لەو جیهانەدا نازانێت درۆبکات.

* * * * *

- رەنگە من دژی شتێك بم، بەڵام هیچ بە پێویستی نازانم، کە ئەو شتە بە شتیکی چەپەڵ و ناشیرین وەسفی بکەم، یاخۆ مافی باوەڕهێنان بەو شتە لە خەڵك قەدەخە بکەم.

* * * * *

- ئەگەر کەس خۆشی نەوێت بەدبەختییە، ئەگەر کەست خۆش نەوێت کارەساتە!..

* * * * *

- دەوڵەمەندانی رەزیل وەك (هێستر و کەر) وان، کە بارەکەیان زێڕ و زیوە و خۆراکیشیان کا و جۆیە.

* * * * *

- دەستەبەرکردنی خۆشەویستی مەزنترین سەرکەوتنە لە ژیاندا.

* * * * *

- ڕێگەی سادە بۆ ناسینی شارێك، ئەوەیە، کە پیاو بزانێ خەڵکەکەی چۆن دەژین و چۆن خۆشەویستی دەکەن و چۆن دەمرن.

*****

- ڕۆمان هیچ نییە، جگە لە فەلسەفەیەك لە قالبی چیرۆکدا نەبێت.

*****

- ئێمە بڕیارمان داوە، کە سیاسەت بسڕینەوە بۆ ئەوەی ڕەوشت شوێنی بگرێتەوە، هەر ئەمەشە ناوی دەنێین شۆڕش.

*****

**(ئەندرێ جید) ڕەخنەگر و ڕۆماننووسی فەرەنسایی**

- ئەوە یەکێکە لە یاساکانی ژیان، کە هەر وەختێك دەرگەیەکمان لێ داخرا، دەرگەیەکی دیکەمان لێ دەکرێتەوە، بەڵام کارەسات لەوەدایە، کە ئێمە هەر سەیری دەرگە داخراوەکە دەکەین و کراوەکە پشتگوێ دەخەین.

**(ئەدۆرنۆ) فەیلەسووفی ئەڵمانیایی**

- من لە گەڕانەوەی فاشیزم ناترسم لە دەمامکی فاشیزمدا، بگرە لە گەڕانەوەی فاشیزم دەترسم لە دەمامکی دیموکراسیدا.

*****

**(ئەحمەد کایا) هونەرمەندی ناوداری کورد**

- تانك و تۆپ و فڕۆکەکانتان هێندە پێ ئاشناکردووین، ئێستە منداڵەکانمان حەزدەکەن وەك بووکە شوشە یاریان پێ بکەن!..

*****

• ئامادەم باجی کوردبوونی خۆم بدەم، تەنانەت ئەگەر بە دوورخستنەوەشم بێت لە ماڵ و منداڵم.

*****

• کچەکەم، من چل ساڵ لە تورکیادا بە تورکی ژیام، تۆ لەوەیاندا مەچۆوە سەرمن و هەمووی بە کوردی بژی..

*****

• دایکم هەمیشە ئامۆژگاری دەکردم، کە هەرگیز درۆ نەکەم، بەڵام کاتێك کێشەیەکم دەنایەوە دایکم لە لای باوکم دەیگووت ئەسڵەن ئەمڕۆ ئەحمەد ناساغ بووە و دەرەوەی هەر نەبینیوە!. ئەوەم لە هەموو دایکێك بینیوە، کە هەموو قوربانییەك دەدەن لە پێناو منداڵەکانیان.

*****

• خۆ ئێمە گرووپێکی سەد کەسی نین، ئێوە چۆن لە ڕووتان دێت نکۆڵی لە میللەتێك بکەن، کە زێتر لە شەست ملیۆنە، کوردبوونمان لە بازاڕ نەکڕیوە نەکەس بەخێر پێی داوین، تا ئێمە دەستبەرداری بین، منتان بە هۆی بانگەشەی کوردبوونم دادگەیی کردووە نازانم دەتانەوێت چی بەدەست بێنن؟، چاوەڕێی ئەوە دەکەن من بڵێم ببوورن من بەهەڵەدا چووم و کورد نیم.

*****

• خوام بەم شێوەیە خۆش دەوێت، کە خۆم دەیناسم.

*****

• هیچ ئەشکەنجەیەك هێندەی ئەو ئازارە بە ئێش نییە، کە لە نیشتمانی خۆت بێگانەیەك دەرت بکات!..

*****

• هەرەشەم لێدەکەن، کە گوایە ئەگەر بێدەنگ نەبم زمانم دەبڕن، بەڵام نازانن بایی ئەوەندە قسەم کردووە و گۆرانیم چڕیووە، کە بەو ئاخر و ئۆخرەی تەمەنمەوە پێویستم بە زمان نەبێت، کە زمانتان بڕیم قسە نەگوتراو و تەواو نەکراوەکان جێدەهێڵم بۆ ئەو نەوە تازەیەی، کە بێدەنگ ناکرێن.

* * * * *

• لە بێدەنگییەکی زۆردا خەومان لێکەوت، کاتێك بەئاگا هاتین، سەدان زیندان و هەزاران کۆتوبەندیان بۆ چێ کردبووین، ئیدی ئارەقەی شەرمم لەنێوچاوانم سڕی و گوتم هەڤاڵان ئا ئەمەیە باجی بێدەنگی و بێئاگایی.

* * * * *

• من بەبێ تاکە یەك پێکەنین زیاتر لە نیوەی تەمەنم بەڕێ کردووە، لەبری هەر شتێکی دیکە فێرم بکە چۆن پێبکەنم و گریانم بیرچێتەوە.

* * * * *

• لە غەریبی گەورە بووم و لە غوربەتدا وا دەمرم، ئازادی ئەوڕۆ یان سبەی خۆر هەر هەڵدێت، ئەوسا بمبەنەوە لە هەرکوێی نیشتمان دەمنێژن بمنێژن، بەس ئەو غەریبییەم لەیەخە بکەنەوە!.

* * * * *

• ئێوە ئەی شۆڤێنییەکان، نەژادپەرستەکان فاشیستەکان، گوێ لە گۆرانییەکانم مەگرن، جگە لەوەی من لایەنگری ئاشتیم، لەگەڵ ئەوانەشم مافیان خوراوە، بەڵام دەهەمبەر تورکێکی نەژادپەرست، من کوردم بەرانبەر کوردێکی نەژادپەرستیش، من تورکم.

* * * * *

- کەسایەتییە ئاینییەکان دەیانەوێت ئێمە لە خودا بترسێنن، بەڵام من دەمەوێت لە خودا نەترسێن، بەڵکو خۆشمان بوێت، ئەوەیە ناکۆکی من لەگەڵ ئەو زانا ئاینییانەی لەوە تێنەگەیشتوون، کە خودا مەترسیدار نییە خودا میهرەبانە.
- کە لە تورکیا هەڵاتم پێیان دەوتم بیربکەوە چ هەڵەیەکت کرد!. ئەگەر وتنی (من کوردم) هەڵە بێت، ئەوە دەمەوێت چەندجارێکی دیکەش ئەو هەڵەیە دووبارەبکەمەوە وەك ئێستە ( من کوردم).

*****

- ئیدی بەسە شتێکم پێ بڵێ نەیزانم!. بۆ نموونە خۆشبەختیم پێ بناسێنە.

*****

- ئێمەی کورد لەگەڵ هەزاران جۆری ئازار ڕاهاتووین، زیندانەکانتان هەتا بەرتەسکتر بن، ئیرادەی ئێمە فرەوانتر دەکەن.

*****

- ئەو هەموو ئازارە دەچێژین، ئەو هەموو خەمە دەخۆین، بەو هێواشییەش دەمرین !.

*****

- بە هێواشی پێ بنێن بەسەر زەوی نیشتمان من، شوێنێك نەماوە تەرمێکی ئێمەی لێ نەنێژرابێت.

*****

- هەڵوێست وەرگرتنەکانی من بۆ باشترکردنی ژیانی خۆم نییە، بە داهاتی تەنها یەك کۆنسێرتم دەتوانم ساڵێك بە شاهانەیی بژیم، خەمی من بۆ ئەو نەوەیەیە، کە تازە پێدەگەن نامەوێت هەموو ژیانیان بە کەلەپچەکراوی

بەسەربەرن، مـن ئەگـەر زۆر بـژیم چـەند سـاڵێکی دیکـە دەژیـم، بـەڵام ژیـانی نائازادانەی ئەو نەوەیەی پێدەگات ئازارم دەدات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● (کوردستان) ئێستەی بوونم لە پـاریس، وەك ئـەو ئاشـقەیە، کـە لـەتاو بینینی یارەکەی، کە ناهێڵن بیبینێت وا لە شێتخانەیە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● من لە خۆشی هاتنی مـردن دەمـرم و نایـەت، ڕۆژگـاریش بـۆ ئـەوەی ئازاری زیاتر بچێژم منی لە چاوی مەرگ شاردۆتەوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(ئەنیشتاین) زانای گەردوونناسی ئەڵمانیا**

● لەنێوان کەسایەتیی و ناوبانگدا زیـاتر گرینگـی بـە کەسـایەتیی بـدە، چونکە کەسایەتیی واتە تۆ کێیت، بەڵام ناوبانگ واتـە خـەڵك چـۆن بـیر لـە تـۆ دەکەنەوە!!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ترسم لـەو ڕۆژگـارە هەیـە تـەکنۆلۆژیا جێگـەی پێوەنـدیی مرۆڤـەکان بگرێتەوە، چونکە ئەو کات سەرتاپای جیهان دەبێتە خاوەنی نەوەیەکی گەمژە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● دوو شت ئەبەدین: گەردوون و گەمـژەیی مـرۆڤ و مـن لـە ئەبەدیـەتی گەردوون گومانم هەیە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- زۆرینەی خەڵکی نارِەزاییان بەرامبەر شێوە و ڕووخساریان هەیە، بەڵام زۆر کەم لە خەڵکی نارِەزاییان بەرامبەر مێشکیان هەیە.

*****

- پەروەردە ئەو شتەیە، کە دەمێنێتەوە پاش لە بیرکردنی هەموو ئەو شتانەی کە کەسێك لە قوتابخانە فێریان دەبێت.

*****

- ئێمە ناتوانین چارەسەری ئەو کێشانە بکەین، بەبەکارهێنانی هەمان ئەو بیرکردنەوەیەی، کە بۆ دروستکردنی کێشەکە بەکارمان هێنا.

*****

- ئەگەرکەسێك لە شەوێکی سامالّ دا بروانێتە گەردوون و جوانییەکەی ببینێت، ئەگەر ئەو کەسە جۆش و خرۆش نەیگرێت و بیر لە دروستکەرەکەی نەکاتەوە، ئەوا زیندوویەکی مردووە.

*****

- سەرگەردانی مرۆڤ لەوەدایە هەرگیز دەستبەرداری کەرێتی نابێت.

*****

- زیرەکی سنووری هەیە، بەڵام هیچ سنوورێك نییە بۆ بێ ئەقڵی.

*****

• ژیان وەك سواری پاسكیل وەهایە، بۆ ئەوەی هاوسەنگی خۆت ڕابگریت دەبێت بەردەوام بیت لە ڕۆشتن.

*****

(ئەحمەد شاملو) شاعیر و نووسەر و ڕۆژنامەنووسی ئێران

• ئەوانەی کە ئێمە لە هاوڕێیەتی ڕەگەزی بەرامبەر بە ئاگری دۆزەخ دەترسێنن، خۆیان نوێژەکانیان بە هیوای جوتبوون لەگەڵ پەرییەکانی بەهەشت دەکەن!..

*****

• لە ئیسرائیل دەتکوژن ئەگەر لایەنگری فەلەستین بیت، عارەبان دەتکوژن، ئەگەر سیخوڕی زایۆنییەکان بی، زایۆنییەکانیش دەتکوژن، ئەگەر فاشیست بی، فاشییەکانیش دەتکوژن، ئەگەر کۆمۆنیست بیت، کۆمۆنیستەکان دەتکوژن، ئەگەر ئەنارشیست بی، ڕووسەکانیش دەتکوژن، ئەگەر سەگبابی بۆ پاراستنی چین بکەی، چینییەکانیش دەتکوژن، ئەگەر حەرامزادانە خەم بۆ ڕووسیا بخۆی، کوشتن و کوشتن و کوشتن، چ قەسابخانەیەکە ئەم دنیای مرۆڤایەتییە.!..

*****

(ئەفلاتوون) فەیلەسووفی گەورەی یۆنان

• نەهاتنە دنیا باشترە لە فێرنەبوون و بە نەزان مانەوە، چونکە نەزانی ڕیشەی هەموو بەدبەختییەکە.

*****

• گۆڕستانەکان پڕن لە کەسانێك هەمیشە وایان دەزانی ئازان.

*****

- بە حوکمی ئەوەی ئافرەت بوونەوەرێکە ناتوانێ بێدەنگ بێت، ئەگەر کەسی دەست نەکەوێت قسەی بۆ بکات ئەوە لەبەر خۆیەوە گۆرانی دەڵێت.

❊❊❊❊❊

- ئەوانەی زۆر زیرەکن و نایانەوێت بەشداری سیاسەت بکەن، بەوە پاداشتیان دەدرێتەوە، کە لەلایەن کەسانی گێل و نەفامەوە حوکم دەکرێن.

❊❊❊❊❊

- سەیر نییە ئەگەر زۆرینەی خەڵك وتەکانی ئێمە قبووڵ نەکەن، چونکە ئەو بیرۆکانەی ئێمە لەبارەیانەوە دەدوێین، ئەوان هیچکات لە کرداری نەیان بینیوە.

❊❊❊❊❊

- هەرگیز نهێنییەکانت لەو کەسە مەشارەوە، کە دەتوانێ چاوەکانت بخوێنێتەوە، چونکە ئەو کەسەی دەتوانێ چاوەکانت بخوێنێتەوە پسپۆڕیشە لە خوێندنەوەی دڵت.

❊❊❊❊❊

- کەسی نەزان هەوڵ بۆ فێربوونی زانست نادات، چونکە پێی وایە زانایە، ئەمەش هۆی چارەڕەشی و بەدبەختی نەزانەکانە.

❊❊❊❊❊

- ئێستە کاتی جیابوونەوەیە من بەرەو مردن دەڕۆم و ئێوەش بەرەو ژیان، کە درێژەی پێ دەدەن، ڕێگەیەکی باشترە ئەوە کەس ئاگای لێ نییە!..

❊❊❊❊❊

- ئەشقی پاك لەم دنیایەدا دەگمەنە، لەوەش دەگمەنتر هاوڕێی ڕاستەقینەیە.

*****

## ( ئەحمەد مەتەر) شاعیری یاخی عێراق

- دوو کەس لە وڵاتانی ئێمەدا لە بەئاگاهاتنی نوستووەکان لە ترسان هەڵدەلەرزن، ئەوانیش دز و فەرمانڕەوان.

*****

- دز لە ڕۆژئاوا دەبێتە سەرۆکی یانەکان، لە ئەمەریکا دەبێتە سەرۆکی مافیا، بەڵام لە وڵاتانی ئێمە، کە بە حیساب بەشەرعی دین دەستی دز دەبڕدرێت، کەچی دز دەبێتە گەورە و سەرۆکی وڵات.

*****

- لە وڵاتان دەسەڵات دز ڕاودەنێ، کەچی لێرە دز دەسەڵاتە و ئەوانە ڕاو دەنێت کە دزنین !.

*****

- ئەمڕۆ جرجێکم بینی باسی پاکوخاوێنی دەکرد هەڕەشەی دەکرد پیسەکان بە سزای خۆیان بگەیەنێت، لە چواردەوریشی مێشەکان چەپڵەیان بۆ لێدەدا..

*****

- کوڕێك بە کەرێکی وت: ئەی گێلە..کەرەکەش بە کوڕەکەی وت: ها ئەی عارەب..

❊❊❊❊❊

- بەرپرسێکی دزمان ڕادەستی پۆلیس کرد، کەچی خۆمان دادگەیی کراین بە پاساوی سووکایەتی کردن بە ڕەمزێکی ئەو وڵاتە!..
- ئەفرەت لەو سەرکردەیەی بۆ خۆی لە شوێنی ئارام و بەرز بخەوێت، کەچی گەلەکەشی لە گۆڕستان بخەوێت.

❊❊❊❊❊

- لەم نیشتمانەی منیشدا دەتوانرێت لەسەر هەمان شێوە چیرۆکەکە بنووسرێتەوە و بە درێژکراوەی: پیاوێك لەدایك بوو، نەژیا و لەگەڵ ئەوەشدا دەمرێت.

❊❊❊❊❊

**(ئەرستۆ) فەیلەسووفی میتافیزیکی یۆنان**

- مرۆڤ ئاژەڵێکی قسەکەرە.

❊❊❊❊❊

- بۆ ئەوەی لە شەڕی ئافرەت دوور بیت لەبیری بکەی، هەمیشە قەرزاربە.

❊❊❊❊❊

• بە (ئەرستۆ)یان گوت: جوانیمان بۆ لێکدەرەوە، وتی: لەم پرسە گەڕێن بۆ کوێرەکان.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

• پیاوێك بوونی هەیە، کە بە شوێن ئامانج دا دەگەڕێت، ژیانی ئەو کاتێك واتای دەبێت، کە بڕواتە دەرەوە و بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی هەوڵ بدات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

• ئازایەتیی ئەوە نییە ئەوەی دەتەوێت بیڵێیت، بەڵکو ئازایەتیی لەوەدایە: باوەڕت بەو قسانە هەبێت، کە دەیانڵێیت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(ئارنستۆ ساباتۆ) ڕۆماننووس و زانای فیزیك ئەرژەنتین**

• هەندێجار هەست دەکەم هیچ شتێك واتای نییە، لەنێو ئازارەکانـدا لـە دایك دەبین، لەسەر هەسارەیەکی بچووك، کە ملیۆنان ساڵە بـەرەو عـەدەم (فـەنا بوون) دەڕوات: نەشونما دەکەین، نەخۆش دەکەوین، ئازار دەچێژین، دەبینـە هـۆی ئازار بۆ ئەوانی دی، ژاوە ژاو دەکەین، دەمـرین، کەسـانی دیکـەیش دەمـرن لـە کاتێکدا خەڵکانی دی لەدایك دەبن تـا کۆمیـدیا نەزۆکەکـە سـەرلەنوێ دووبـارە ببێتەوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● کارەسات ئەوە نییە، ژەنەراڵێك هاتوچۆ لە شەقامەکاندا قەدەخە بکات، کارەسات ئەوەیە، هاتوچۆی وشە لە ناخماندا قەدەخە بێت و ترس وامان لێ بکات، زاتی ئەوەمان نەبێت، قسەی دڵی خۆمان بکەین.

*****

**(ئۆسکاروایلد) هونەرمەندو نووسەری چیرۆك و شانۆی ئێرلەندا**

● خەفەت شتێکە کەوا مرۆڤی بێ ئەقڵ دەرخواردی مرۆڤی ئاقڵی دەدات.

*****

● هەرکەسێك بە شوێن ژنێکی باش و ژیر و جواندا بگەڕێت، لەڕاستیدا بەشوێن سێ ژندا دەگەڕێت.

*****

● لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا مرۆڤ نرخی هەموو شتێك دەزانێت، بەس بەهای هیچ شتێك نازانێت!..

*****

● لە کێویان پرسی: ئەم بەرزیەت لە کوێوە هێناوە؟ گوتی:لە دۆڵەکەی بەردەممەوە..

*****

**(ئال پاچینۆ) ئەکتەر و دەرهێنەری سینەما و شانۆی ئەمەریکایی**

- ئەوەندە ساویلکە نیم، بەڵام وا دەبینم گەمژانەترین کاری ئێستە ئاشق بوونی دوو کەسە لەنێو بێوەفابوونی هەمووانداا، هاوکات گەمژەتر لەوان ئەوانەن کە سوێند بە گیانی یەکتریش بخۆن.

* * * * *

- گرینگایەتیی پیاوێك، دوژمنانی چاکتر هەستی پێ دەکەن و دەیزانن، نەك دۆستەکانی!.
- هەمیشە باوکم پێی دەگوتم، کە بۆ دۆستانم نێزیك بم، بەڵام بۆ دوژمنانم نێزیکتر، چونکە دوژمنانت بەتەنها یەکجار لە ناوت دەبەن، بەڵام دۆستانت دەکرێ هەموو ڕۆژێك بەناوی خۆشەویستییەوە لە ناوت ببەن.

* * * * *

**(ئۆشۆ) هزرڤانی بواری پاراسایکۆلۆجی و یۆگای هیندستان**

- کەموکوڕی هەقیقەتی ژیانە، ئێوە دەتانەوێت بگەن بە کامڵ بوون، بەڵام من ڕازیم بەو کەموکوڕیانەی خۆم، ئەمەیە جیاوازی نێوان من و ئێوە.

* * * * *

- من هەرگیز لە دایك نابم، هەرگیزیش نامرم، بەڵکو سەردانی زەویم کردووە.

* * * * *

- (ژیان) خۆی لە خۆیدا نە چەرمەسەری و ڕەنجە، نە کامەرانی و بەختەوەری (ژیان) تابلۆیەکی سپی نەخشێنراوە، مرۆڤ دەبێت زۆر هونەرمەندانە لەگەڵیدا هەڵسوکەوت بکات.

* * * * *

• مرۆڤ بوونەوەرێکی سەیرە، لە هەموو شتێك دەکۆڵێتەوە، تا لووتکەی ئێڤەرێست دەڕوات، تا جەمسەری باکور و هەسارەی مانگ دەڕوات، بەڵام هەرگیز بیر لەوە ناکاتەوە، کە سەرێك لە دەروونی خۆی بدات، ئەمە مەزنترین نەخۆشییە، کە مرۆڤایەتی گرفتاریەتی.

* * * * *

• خەم بۆ ئەو درەختانە دەخۆم، کە دەیانبڕن و دەیانکەن بە کاخەز و سیاسەتمەدارەکان زیاتر خەڵکی پێ دەگەوجێنن لە ڕێگەی ڕۆژنامەکانیانەوە.

* * * * *

• هەوڵی من لە نووسیندا ئەوەیە بە تێکشکاندنی بیرکردنەوەی بە کۆمەڵ و ڕۆشتن و ڕێگەبڕینی وەك قاز و مێگەل، هەموو مرۆڤەکان لەو کۆتوبەندانە ئازادکەم هەتا بتوانن وەك خۆیان بن.

* * * * *

• ڕاستیی کاڵایەك نییە، کە لە لایەن خەڵکەوە بکڕدرێت!..
• سەیر لەوەدایە، ئەو مرۆڤانەی، کە گەورەترین کاریگەریان هەیە لەسەر ژیانمان، لە کەمترین ماوەشدا لە ژیانماندا دەمێننەوە.
• ژیان ترسناك دەردەکەوێت بۆ ئەوەی بژیت پێویستە چاو نەترس بیت، ترسنۆکەکان دێنە دنیاوە، بەڵام ناژین و تەنها هەناسە دەدەن..

* * * * *

**(ئۆریانا فالاچی) ڕۆژنامەنووس و نووسەری سیاسی ئیتاڵیا**

- تاکە بەڵگەیەکی سەلمێنەر بۆ گەمژەیی مرۆڤ ئەوەیە خۆی زیندان دروست دەکات و خۆشی تێیدا بەند دەکرێت.

❊❊❊❊❊

- دەکرێ مرۆڤ بیست ساڵ لەگەڵ کەسێك بژی و ئەو کەسە وەك نامۆ و غەریبێك بێ بۆی، واشدەبێ لەگەڵ کەسێك بیست خولەك بەسەر ببات و تا کۆتایی تەمەنی ئەو کەسە لەبیر نەکات.

❊❊❊❊❊

- خوێندکاران بۆیە فێری زۆرشت نابن، چونکە هەر لە سەرەتای خوێندنەوە بۆ بڕوانامە دەخوێنن نەك بۆ زانین.

❊❊❊❊❊

- ئافرەتی جوان پێویستی بە مکیاژ نییە، مکیاژ واتە داپۆشینی کەموکوڕییەکان.

❊❊❊❊❊

- پیاو توخمێکی سێکس پەرستە، بێ سڵەمینەوە دەتوانم بڵێم: جەستەی ڕووتی یەك ئافرەت توانای تێکشکاندنی یەك سوپای چەکداری پیاوی هەیە.

❊❊❊❊❊

- هیچ دیار نییە، بۆچی مرۆڤ هەمیشە ئاشقی کەسێك دەبێت، کە شایەنی ئەو ئەشقە نییە.

* * * * *

- مرۆڤ کە لە ژیانیدا ئامانجێکی هەبوو بۆی بژی، ئیدی بەرگەی هەموو جۆرە ئازارێك دەگرێت..

* * * * *

- گوناه لەو ڕۆژەوە دروست نەبوو (حەوا) سێوەکەی لێکردەوە، بەڵکو لەو ڕۆژەوە دروست بوو، مرۆڤ نافەرمانی کرد.

* * * * *

- ئەگەر ئافرەتێك بەڕووتی بەسەر شەقامدا ڕابکات شارێك لە پیاو دوای دەکەوێت، بەڵام ئەگەر پێیان بڵێی وا شارێك دەسووتێت هەموویان پاساوێك دەهێننەوە، کە توانای ڕاکردنیان نییە!.

* * * * *

**(ئالدۆس هەکسلی) ڕۆماننووس و چیرۆکنووسی بەریتانیا**

- ڕۆشنبیر ئەو کەسەیە، کە شتێکی دۆزیوەتەوە خۆشتر لە سێکس.

* * * * *

**(ئۆرهان پاموك) نووسەرو ڕۆماننووسی تورکیا**

- ژن هەمیشە مێژووی خۆی لە هاوسەرگیرییەوە دەست پێدەکات، نەك لە ڕۆژی لە دایك بوونییەوە.

* * * * *

- مرۆڤ لە وڵاتێکی هەژاردا، لە بیر و باوەڕەکانی بترازێت هیچ شتێکی دیکەی نییە باوەشی پێدا بکات.

*****

**(ئینگرید بێرگمان) ئەکتەری ناوداری سوید**

- ماچ فێڵێکی جوانە، کە سروشت دایهێناوە بۆ کۆتایی هێنان بە قسە ئەو کاتانەی وشەکان واتای خۆیان لە دەستدەدەن.

*****

**(ئاناتۆڵ فرانس) ڕۆماننووسی فەرەنسایی**

- ئافرەتی چاك ئەو ئافرەتەیە، کە ڕاهێنەری فەرمی پیاوەکەی بێت و ڕازێنەری رەوشت و ئاکاری پیاوەکەی بێت.

*****

- **(ئانا گاوالدا) ڕۆماننووسی فەرەنسایی**

- 

هڵەکردن کارێکی مرۆڤانەیە، بەڵام دووبارەکردنەوەی کارێکی چوار پێیانەیە.

*****

- دەبێ چەند کات تێپەڕێت تا بۆنی جەستەی ئەو کەسەت بیربچێتەوە، کە خۆشت ویستوە؟ دەبێ چەند کات تێپەڕێت تا بتوانی ئیتر خۆشت نەوێت؟!.

*****

**(ئانتۆنی هاپکینز) ئەکتەر و موزیکژانی بەریتانیایی**

- فەلسەفەی من ئەوەیە: بۆم گرینگ نییە کەسانی دیکە بە چ شێوەیەك لەبارەی منەوە دەدوێن و چ جۆرە بیرکردنەوەیەکیان لەسەر من هەیە، من خۆمم و

هەرشتێك كەیف خۆشم بكات و زیانی بۆ كەس نەبێت ئەنجامی دەدەم، هیچ چاوەڕوانییەكم نییە و ڕازیم، بەو شێوەیە ژیان زۆر ئاسانترە.

* * * * *

**(ئیپیكۆروس) فەیلەسووفی یۆنان**

- ئەو كاتەی كە من هەم، مردن نییە، ئەو كاتە مردن هەیە، من نیم.

* * * * *

**(ئێدگار ئالەن پۆ) چیرۆكنووس و شاعیری ئەمەریكایی**

- هەڵەی شێتیی لە چیدایە؟ هەڵەی شێت ئەوەیە زیاتر لە سنووری مرۆڤێكی ئاقڵ هەست بە شتەكان دەكات!..

* * * * *

**(ئەمیل سیوران) فەیلەسووف و ڕۆماننووسی ڕۆمانیایی**

- هەموو ئەوەی لە خوێندنگە فێری بووم، بەكەڵكی ئەوە نەهاتن دوو خوولەك قسەی پێبكەم، پێم وایە پێویستە بەس ئەوەندە بخوێنین تا فێری خوێندنەوە دەبین، ئەوسا پەلاماری پەڕتووكی دەرەوەی خوێندنگە بدەین و دەست لە خوێندن هەڵگرین بڕوانامە تەنها كوشتنی كاتە.

* * * * *

- ئەگەر ناتوانی لە ژیان بەردەوام بیت، بۆ خۆت گێل دەكەیت شتێك بنێ بەسەری خۆتەوە.

* * * * *

- هیچ هێزێك هێندەی (درۆ و دراو) مرۆڤەكان لە دەوری یەكدی كۆناكاتەوە.

*****

- کە مرۆڤ ئەو هەموو گۆڕە بێشومارە دەبینێت دەپرسێت: ئەوە دەڵێی مرۆڤ لە مردن زیاتر هیچ شتێکی دیکەیان نییە بیکەن؟.

*****

- ژیان جوانە، ژیان خۆشە، ژیان بەختەوەرییە، ژیان هیوا و ئاواتە، ئەوانە قۆرترینی ئەو قسانەن، کە بە ئەقڵمدا تێپەڕ نابن.

*****

**(ئانتۆنی دساینت) نووسەری فەرەنسایی**

- دۆستی ڕاستەقینە هەڵەکانت پێ دەڵێت، بەڵام دۆستی درۆزن هەڵەکانت بەوانی دیکە دەڵێت.

*****

**(ئیبن تەیمیە) زانای ئاین و گەردوونناسی سووریایی**

- هەموو خۆشەویستییەکان بە مەرگ کۆتاییان پێدێت، بەڵام خۆشەویستی لە ڕێی خودا ڕایەڵەی تا بەهەشتی نەبڕاوەیە.

*****

**(ئیبراهیم فەقێ) شارەزای زمان میسریی**

- سەرکەوتن گەیشتن بە وێستگەی کۆتایی نییە، بەڵکو لەوانەیە سەرەتای دەستپێك بێت.

**(ئینگلیزی)**

- ئەگەر مەبەستتە هیچکات بەرانبەر قازی دانەنیشی لە پشت یاساوە بە ئارامی برۆ..

❊❊❊❊❊

**(ئەمین مەعلوف) هزرڤان و ڕۆژنامەنووسی لوبنانیی**

- خودا چەند گەورە و جوانە، کە بێبەرییە لە هەموو ئەو کارە ناشیرین و کوشتار و توندوتیژیانەی، کە بە ناوی ئەوەوە ئەنجام دەدرێن.

❊❊❊❊❊

**( ئەزدەمیر ئەسەف) شاعیری تورکیا**

- خۆشەویستی ئارامگرتنی زۆری دەوێت، دەبێت بتوانی بە برینەکانی ژیانەوە لەسەر پێ بوەستی.

❊❊❊❊❊

**(ئیمامی شافعی) سێیەم پێشەوای موسڵمانی فەڵەستینیی**

- هەر کەسێك باسی خەڵکی بۆ هێنایت، دڵنیابە باسی تۆش بۆ خەڵکی دەبات.

❊❊❊❊❊

**(ئەحمەد شێواو) شاعیری کورد کە لە برسان مرد**

- لە خەونەکانیشمدا هەر برسی بووم، هەر کاتێك خەوم بە نانەوە دەبینی یەکێك خەبەری دەکردمەوە.

❊❊❊❊❊

- جاشایەتی لەناو کورددا وەك جگەرەیە و تەرك ناکرێت !.

❊❊❊❊❊

**(ئەنیس مەنسوور) نووسەر و ڕۆژنامەنووسی میسریی**

- پێی گوتم" من هاوڕێیەتی فەیلەسووفێك دەکەم و شاعیرێکم خۆشدەوێت و شوو بە بازرگانێك دەکەم!.

❊❊❊❊❊

- هیچ داهاتوویەك بۆ ئەو كەسە نییە، كە ئێستەی بۆ خەمەكانی ڕابردوو بەفیڕۆ دەدات.

**(ئیبن مەسعود) پیاو چاكی ئیسلام سعودیایی**

- ئەگەر كەسێك لە گۆشەیەكدا حەفتا ساڵ خواپەرستی بكات، بەڵام زاڵمی خۆش بوێ خوای گەورە لەگەڵ خۆشەویستەكەی دا زیندووی دەكاتەوە.

* * * * *

**(ئەحمەد موختار جاف) شاعیری ناوداری كورد**

- ویژدان تەنها هەر ناوی هەیە و كەس بە چاو نەیدیوە.

* * * * *

**(ئارەزوو میەری) شاعیری ئێران**

- كەسێك بە حەز و ئارەزووی خۆی ڕۆیشتبێ، یەك چركە دڵتەنگی بۆی گەمژایەتییە.

* * * * *

**(ئابیل بونار) نووسەری فەرەنسایی**

- لە خۆشەویستیدا مرۆڤ پێویستی بەوە هەیە، كە بڕوا بكات، بەڵام لە هاوڕێیەتیدا پێویستی بەوە هەیە كە تێبگات.

* * * * *

**(ئیبراهیم پاشا) میری میرنشینی بابان لە كوردستان**

- لە جیهان دا سێ جۆرە دڕندە هەیە (شێر، پڵنگ و گورگ) سێ هۆكاریش مرۆڤ پارچە پارچە دەكات لە خۆباییبوون، ئیرەیی و پلەوپایە.

* * * * *

**(ئسما یلز) شاعیر و نووسەری بەریتانیا**

- کەسانی ئاقڵ و بە رەوشت هەرگیز قسەیەکیان بەزاردا نایەت، کە هەستی کەسانی دیکە بریندار بکات.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

**(ئەحمەد زویل) زانای کیمیاگەری میسر**

- ڕۆژئاواییەکان بلیمەت نین و ئێمەش گەمژە نین، جیاوازی ئێمە و ئەوان ئەوەیە: ئەوان دەستی فاشیلەکان دەگرن تا سەردەکەون، بەڵام ئێمە دژایەتیی سەرکەوتووەکان دەکەین تا فەشەل دەهێنن!..

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

**(ئەستیون هاوکینگ) فەیلەسووفی بەریتانیایی**

- گەورەترین دوژمن نەزانی و نەفامی نییە، بەڵکو ئەوەیە کە تۆ بڵێی من هەموو شتێك دەزانم.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

**(ئیبراهیم ئەحمەد) سیاسەتوان و نووسەر و ڕۆژنامەنووسی کورد**

- ئەگەر نەتوانرا بێت (کورد) بە جیهان بناسێنرێت، ئەوە هۆکارەکەی فەرامۆشکردنی هونەر و وەرزش بووە، چونکە خەباتی چەکداری بە تەنها هۆکار نییە بۆ ناساندنی هیچ میللەتێك و بە بێ ئەو دووانە نوقسان دەبێت.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

- لەبارەی کەموکورتی کەسانی دیکە گەڕان و گفتوگۆ مەکەن، لەبارەی لاوازییەکانی خۆشتان گەڕان و گفتوگۆ مەکەن، هەر کاتێك هەڵەیەکتان کرد، دان بەهەڵەکانتاندا بنێن و ڕاستی بکەنەوە و لەو هەڵەیەوە فێربن.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

## (ئەدلەر) دەروونناسی نەمسایی

- فەرماندان بە کەسێکی دیکە بەوەی، کە چۆن رەفتار بکات یەکێکە لە فێڵە پەسەندکراوەکانی ئیرەیی، زۆر جار کەسانێك رێنوێنیمان دەکەن بەوەی، کە چۆن بیربکەینەوە، چ کارێك ئەنجام بدەین، سەیری کوێ بکەین، لە ڕاستیدا ئەوە جۆرێکە لە ئیرەیی، کەم بەهاکردن و سەرزەنشکردنی تاکێکی دیکە، ئامانجی هەموو حەسودەکانیش برێتییە لە دەست بەسەر داگرتنی ئازادی و ئیرادەی ئەوانی دیکە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

## (ئەبراهام لینکۆلن) سەرۆکی پێشووتری ئەمەریکا

- ئەگەر شەش کاتژمێرم بدەیتێ بۆ بڕینی درەختێك، ئەوا من چوار کاتژمێری یەکەم بۆ تیژکردنی تەورەکەم بەکاردێنم.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- من هێندە بەتەنگی ئەوەوە نیم، کە ئاخۆ خودا لایەنی ئێمەی گرتووە، خەمی گەورەی من هەمیشە ئەوەیە، کە ئاخۆ من لایەنی خودام گرتووە!، چونکە خودا هەمیشە لایەنی هەقە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ناتوانی لە بەرپرسیارەتیی بەیانی ڕابکەی، بە خۆدزینەوەی ئەمڕۆت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- کاتێك کە چاکە دەکەم، هەست بە باشی دەکەم، کاتێك کە خراپە دەکەم هەست بە خراپی دەکەم، ئەوەیە ئاینی من.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ئازادی واتە نە دەبمە کۆیلەی کەس و نە کەسیش دەکەمە کۆیلەی خۆم.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- بۆ کوشتن هیچ شێوازێك نییە شەرەفمەندانە بێت، لە وێرانکردنیشدا هیچ ڕێگەیەکی نەرم و نیان نادۆزیتەوە، هیچ شتێکی باش لە جەنگدا نییە، جگە لە کۆتایی پێهێنانی.
- هەمیشە مرۆڤەکان بەهیواکانیانەوە دەگەنە ئامانج.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(ئەنتونی رابینز) دەروونناسی ئەمەریکایی**

- سەیرکە، زۆرێك لە خەڵکی دەزانن دەبێت چی بکەن، بەڵام کەمێك لەو خەڵکانە ئەوە دەکەن کە دەیزانن، زانین بە تەنها بەس نییە، بەڵکو پێویستە تۆ جووڵە (کار) بکەی.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(ئەریك فرۆم) فەیلەسووف و دەروونناسی ئەڵمانیایی**

- لە ڕاستیدا مردن بەرەکەتێکی خوداییە. بەبێ مردن هیچ پێشکەوتنێکی راستەقینە نەدەبوو، ئەو کەسانەی، کە بۆ هەتا هەتایە دەژیان، نەك بە تەنها دەبوونە رێگر و لەمپەر لەبەردەم گەنج، بەڵکو لە خودی خۆیاندا پاڵنەری تەواویان نەدەبوو بۆ داهێنان.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- زانست فێری رەخنەگرتن و، هونەریش فێری هەستکردن بە جوانیمان دەکات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- خۆشەویستی تاکە چارەسەری تەندروست و ڕازیکەرە بۆ گرفتەکانی بوونی مرۆڤ.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- تۆ کە ناتوانی قسەکەرێکی باشبیت، لانیکەم گوێگرێکی باشبە.

* * * * *

**(ئەبو عەلی سینا) زانای گەورەی موسڵمانیی ئێرانیی**

- تەنیا شتێك زانایی دەڕازێنێتەوە، ڕاستییە.

* * * * *

**(ئەسكەندەری مەزن) گەورە ئیمپراتۆری مەكدۆنیا**

- كە مردم دەستەكانم لە تابوتەكەمەوە بهێننە دەرەوە، بۆ ئەوەی خەڵكی ببینن ئەو هەموو سامانەی لە دنیادا هەمبوو نەمتوانی هیچی لەگەڵ خۆمدا ببەم.

* * * * *

**(ئەنوەر سادات) سێیەمین سەرۆك كۆماری میسریی**

- هیچ دەسەڵاتێك لە دنیادا ناتوانێت ببێتە جەلاد و دیكتاتۆر بەسەر هاووڵاتییەكانییەوە، ئەگەر هاووڵاتییەكانی ساز و ئامادە نەبن بۆ سەرنەوی كردن و سەركوتكردن و خۆ كۆیلەكردن!.

* * * * *

## پیتی ( ب )

**(بێرناردشۆ) نووسەری شانۆیی و ڕەخنەگری ئەدەبی ئێرلەندایی**

- ئافرەتان گرینگی بە رووخساریان دەدەن لەبری مێشکیان، چونکە دەزانن پیاوان گەمژەن، نەوەك كوێ!..

*****

- كۆمەڵگە بەسەر دوو بەشدا دابەش بووە، ئاقڵی بەدبەخت و گەمژەی خۆشبەخت.

*****

- تاكە شتێك كە مرۆڤ چاوی تێنابڕێت، كە مرۆڤێكی دیكە دەیكاتە بەری، ئەو پۆشاكەیە، كە پێی دەڵێن كفن.

*****

- ڕەوشت، وێردی سەر زمانی ئەو كەسانەیە، كە نیانە!..

*****

- ژنان تەنها دوو ڕۆژ دەتوانن مێردەكانیان بەختەوەر بكەن، ڕۆژی زەماوەند و رۆژی مەرگ.
- ئافرەت لەیەك كاتدا حەفتا و حەوت ڕای هەیە.

*****

- ژیان برێتیی نییە لە دۆزینەوەی خۆت، بەڵكو ژیان برێتییە لە دروستكردنی خۆت.

*****

- بێ رەوشتی و درۆزنی، هەرگیز ناتوانرێ بە نازناو و جلوبەرگی گرانبەها داپۆشرێ.

*****

- هۆکاری ئەوەی، کە مرۆڤی باوەڕدار ئاسوودەترە لە مرۆڤی بەگومان، هەمان ئەو هۆکارەیە، کە مرۆڤی مەست ئاسوودەترە لە مرۆڤی بەئاگا.

*****

- هەندێ ئافرەت، توانای هونەری قسەکردنیان نامێنێ، بەڵام بەداخەوە توانای قسەکردنیان دەمێنێ!...

*****

- بەسەر بردنی ژیانێك بە ئەنجامدانی هەڵەوە نەك هەر شەرەفمەندانەترە، بەڵکو زۆر باشترە لە بەسەربردنی ژیانێك بە ئەنجام نەدانی هیچ شتێك.
- پیاو زۆر جار، بە گوێیەکی دەبیستێ و لە گوێکەی دیکەی دەچێتە دەرەوە، بەڵام ژن، بە هەردوو گوێی دەبیستێ و لە زاری دەچێتە دەرەوە!..

*****

- بێ دەنگی وەك خەسڵەتێك هەڵبژێرە، چونکە بە هۆی ئەوەوە گوێت لە هەڵەی خەڵکانی دیکە دەبێت خۆت بە دوور ڕادەگری لێیان.
- دوو شت تەواو لەیەك دەچن (ڕادیۆ و ژن) هەردووکیان بەس قسە دەکەن و هیچ نابیستن.

*****

- نیوە زانین،، زۆر ترسناکترە لە نەزانی.

*****

- ئەشق هێزێکی مەزنە، کە دژ بە بەرژەوەندییەکانت دەوەستێتەوە، بەڵام تۆ هەستی پێناکەی.

❊❊❊❊❊

- هەر کاتێك ویستتان تۆڵە لە کەسێك بکەنەوە، ئەوا هانی بدەن هاوسەرگیری بکات.

❊❊❊❊❊

- دەستەواژەی (ئافرەتی مەزن و ژیر) تەنها لە لای ئەو پیاوانە بە کار دەهێندرێت، کە حەزیان لە سێکسە، دەنا قسەیەکی وەها بوختانە بە ئافرەت دەکرێت.

❊❊❊❊❊

- ئەوانەی لە نیشتمان هەڵاتن و نیشتمانیان فرۆشت، ئێستە خاوەنی نیشتمانن، ئەوانەی گیانی خۆیان لە پێناو نیشتماندا بەخشی ئێستە جێگەیەك لەو نیشتمانەدا نییە بۆ کوڕ و نەوەکانیان.

❊❊❊❊❊

- پارچە کاخەزێك بخەرە بەردەستی ژن و بڵێ ژیانی خۆتم بە پوختی بۆ بنووسە، هەموو شتێکت بۆ دەنووسێت هەتا باسی رەنگی جلی ژێرەوەشت بۆ دەکات، جگە لەئاماژەکردن بە تەمەنی!.

❊❊❊❊❊

- یەکێك لە سەیر و سەمەرەکانی مەرگ ئەوەیە، لە کاتێکدا کە ئێمە خۆمان بۆ ژیانێکی شیرین ئامادەکردووە ئەو دەماندۆزێتەوە.

❊❊❊❊❊

- کە مرۆڤ شێرێك دەکوژێت دەڵێن ئازایە، بەڵام کە شێر مرۆڤ دەکوژێت دەڵێن دڕندەیە.

❊❊❊❊❊

- هەرگیز بۆ پارە شوو مەکە، چونکە بۆ پارە پەیداکردن: ڕێگەی ئاسانتر هەیە!..

*****

- فەرمانگەکانی حکوومەت زۆر سوودیان پێ بەخشیم، لێیانەوە فێری ئارام گرتنی (ئەیوب) بووم.

*****

- تازە هەڕەتی لاویم بوو گوتیان خۆشەویستەکەت ناپاکیت لێ دەکات، گوتم دەزانم، گوتیان ئەو کارە واتە ئەو تۆی خۆشناوێت، گوتم دەزانم، گوتیان ڕۆژێك دەڕوا و بەتەنیا جێت دەهێڵێت، گوتم دەزانم، گوتیان ئەدی بۆ لەگەڵیدا دەمێنیتەوە؟، گوتم ئەوە تەنها شتە کە نایزانم.

*****

- لە بێرناردشۆ دەپرسن ئەگەر پێت بڵێن گەورەترین درۆ بکە چ درۆیەك دەکەی؟، بێرناردشۆ لە وەڵامدا دەڵێت: بۆ نموونە دەڵێم، ئەمڕۆ دوو ژنم بینی پێکەوە دانیشتبوون بەبێ دەنگ !..

*****

**(بەختیار عەلی) ڕۆماننووس و ڕووناکبیری کورد**

- هەر کەسێك نەیەوێت بدۆڕێت و تووشی شکستخواردن بێت، شتی خراپی لێ دەوەشێتەوە.

*****

- مرۆڤی کامڵ هەرگیز خیانەت لە هەقیقەت ناکات.

*****

- چ تاوانێك لەوە گەورەترە مرۆڤ کەسێکی لە قووڵایی دڵەوە خۆشبووێت و ئەو خۆشی نەوێت!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- سەختترین جۆری ئاوارەیی، ئاوارەیی نییە لە نیشتمان، بەڵکو ئاوارەییە، لە مرۆڤەکانی دیکە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- لەڕێگەی خۆشەویستییەوە مرۆڤ پووچی هەموو شتەکانی بۆ دەردەکەوێت، هەتا پووچی خۆشی.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ئاسانە هەموو رۆژێك چێژ لە ژیان وەربگرین، بەڵام ئەستەمە، کە هەست بە نرخی ڕاستەقینەی ژیان بکەین.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ژیان خۆی لە هەر هێزێکی دیکە جوانتر شتەکان تەفسیر دەکات، هەرگیز هێزی تەفسیرکردنی ئینسان لە ئاستی هێزی تەفسیرکردنی ژیاندا نییە، من ئەم چەند ساڵەی دوایی ئەزموون بۆم دەرکەوت، گەورەترین حیکایەت ژیان خۆیەتی.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- کە تۆ لە ئەزەلەوە خەمگین بوویت، پێکەنین خەمبارترت دەکات، کە تۆ لە ئەزەلەوە تەنها بوویت، پێکەنین تەنهاترت دەکات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ئەوەی وەك من بەدەردێکی قووڵەوە هاتبێتە سەر زەوی بە خەندە بەختەوەر نابێت!...

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- گەر توانیمان لە بەردەمی یەکدا بگرین، ئەوا هاوڕێی یەکین، مرۆڤ تا لە بەردەمی یەکدا نەگری نابێت بە هاوڕێی یەك!..

*****

- مرۆڤ گوڵی خۆشدەوێت، بێ ئەوەی بەلایەوە گرینگ بێت، لەسەر چ خاکێك ڕواوە.

*****

- هەندێك کەس ناتوانن خۆشەویستی یەکەمیان لە بیر بکەن، هەندێکیشیان ناتوانن خۆشەویستی دواهەمینیان لە بیر بکەن، بەڵام بەختەوەرترینیان ئەوانەن، کە خۆشەویستی یەکەمیان دواهەمینە.

*****

- تاکە شتێك لێی ترساوم ئەوە بووە ڕووحم لە جێگەیەك و لەشم لە جێگەیەکی دیکەدا بمرێت، ئەوە ترسی هەرە گەورەی ژیانم بووە.

*****

- ئێمە وا خولقاوین هەر دەستمان بۆ عەشق برد شتێك دەشکێنین..

*****

- مرۆڤ بۆ هەقیقەت دەگەڕێت، بێ ئەوەی بەلایەوە گرینگ بێت، لە چی سەرچاوەیەك هەڵدەقوڵێت.

*****

- گێلییە بۆ کەسێك بگریت، لە کاتێکدا ئەو بیەویت بێ تۆ بژی.

*****

- من شارم نییە، بەڵام شتێکم هەیە لە شار گەورەترە، ئەویش کتێبخانەکەمە.

*****

- سەیرترین شتی دنیا ئەوەیە کتێبەکان قسە ناکەن، کەچی لە ناویاندا سەدان کەس قسە دەکات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

• کێشەی پیاوان لەوەدایە، کە دەزانن ئەو ژنەی بۆی دەگەڕێن بوونی نییە، بەڵام خانمان وا نین ئەوان بە جۆرێك سادە و خۆشبڕوان پێیان وایە ئەو پیاوەی لە خەیاڵیاندایە، دەشێت بیبین و بیدۆزنەوە..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

• کێشەی ئازادیی بەر لەوەی کێشەیەکی سیاسی یان ئەخلاقی بێت، کێشەیەکی فەلسەفییە، هەر کۆمەڵگەیەك پرسیاری فەلسەفی گەورە لە خۆی نەکات ناتوانێت پرسیاری سیاسی گەورەش لە خۆی بکات، لێرەوە لاوازی سیاسەت لە دنیای ئێمەدا ڕیشە قووڵەکەی لە لاوازی بیرکردنەوەی فەلسەفیماندایە، لە هەر جێگەیەك بیرکردنەوەی فەلسەفی نەبوو، ئەستەمە قسە لە ئازادی بکەین، چونکە ئازادی تێڕامانێکی فەلسەفی مرۆڤە لە بوونی خۆی و تێڕامانێکی فەلسەفی کۆمەڵگەیە لە واتای خۆی، بۆیە هەموو دابڕانێکی قووڵ لە فەلسەفە دابڕانێکی قووڵیشە لە ئازادی و دابڕانێکی قووڵیشە لە سیاسەت، وەك چالاکییەك بچووکترین نیگەرانی، کە کار لەسەر کێشەی بە پراکتیککردنی ئازادی دەکات، لێرەوە گەڕانەوەی بەردەوام بۆ فەلسەفەی ئازادی، مەرجی سەرەکیی ئیشکردنە بۆ خودی ئازادی.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

## (بێرتراند ڕاسل) هزرڤان و فەیلەسووفی بەریتانیایی

• مرۆڤ کە دێتە دنیاوە نەزانە، نەك گەمژە، گەمژەیی بەرهەمی پەروەردە و فێرکردنە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

• لەوە مەترسە، کە بۆچوونەکانت نامۆ بن، چۆن هەموو ئەو بیر و بۆچوونانەی، کە ئێستە قبووڵ کراون، ڕۆژانێك سەیر و نامۆ دەرکەوتوون.

٭٭٭٭٭

- کۆمەڵگەی مەرئاسا شایستەی حوکمی گورگە.

٭٭٭٭٭

- دوو پاڵنەر هەن بۆ خوێندنەوەی پەرتووکێك، یەکەمیان ئەوەیە چێژی لێوەردەگریت. ئەوی دیکەیش، ئەوەیە دەتوانیت خۆتی پێ فشبکەیتەوە!...

٭٭٭٭٭

- لەمێژوودا ڕووی نەداوە کەسێك لە تێریدا دزی کردبێت، جگە لە سیاسییەکان!...

٭٭٭٭٭

- ئەگەر هەموو زەویش بگەڕێن، لە ئافرەت جوانتر و بێ ئەقڵتر نادۆزنەوە!...

٭٭٭٭٭

**(بیتهۆڤن) پیانۆژەنی ناوداری ئەڵمانیایی**

- جگە لە گوتن و ڕاگەیاندنی ڕاستی، هیچ تاوانێکی دیکەم نییە، تەنها شتێك کردبێتم ئەوەیە، کە ئەرکی ئاشکراکردنی ڕاستیم جێبەجێ کردووە.

٭٭٭٭٭

- مرۆڤ تا ئەو کاتەی دەتوانێ بژی نابێ لەسەر ویستی خۆی واز لە ژیان بێنێ ئەم قسەیە لە گیانمدا شوێنەوارێکی قووڵی بە جێهێشتبوو ئەگەر بهاتایە و نەمخوێندبایەتەوە، ئەوا زۆر زوو خۆم دەکوشت.

٭٭٭٭٭

- من بۆ ئەوە لەدایك نەبووم خۆشییەکانی دنیا ببینم، بۆ ئەوە لەدایك بووم، کۆمەڵێك ئیشی گەورە بکەم.

٭٭٭٭٭

**(بیرەوەرییەکانی منداڵێك)**

- کە گەورە بووم هەرگیز ژن ناهێنم، بۆ ئەوەی هەموو پیاوانی دنیا بەخیلیم پێبەرن.

*****

**(بروسلی) ئەکتەری سینەمای بەناوبانگی چینی**

- لە دەرەوەی خودی خۆتدا بە دوای کەسایەتییەکی سەرکەوتوودا مەگەڕێ، لەنێو خۆتدا بیدۆزەوە و بەرجەستەی بکە.

*****

**(بابە تاهیری هەمەدانی) شاعیری ناوداری کورد**

- بە گیانمدا گەڕا سێ دەرد بەیەکجار، غەریبی بوو، ئەسیری بوو خەمی یار.

*****

- چووم بۆ گۆڕستانێ سەرم بە دوو گۆڕدا گرت، یەکیان دەوڵەمەند یەکیان هەژارێ، نە دەوڵەمەندەکە دوو بەرگ بوو نە هەژارەکەش بێ بەرگ بوو.

*****

**(بودا) دانای مەزنی ئاینی بودی هیندستانیی**

- ئەوەی لەو باوەڕەدایە، کە دەتوانێ، واتە دەتوانێت بەدەستەێنانی خواستەکانی نەفس دەبێتە هۆی کێشە و ئاڵۆزی، بەدەستەێنان و بەدیهێنانی واستەکانیش نابێتە هۆی سەقامگیری بەردەوام، کەواتە باشترە لە جیاتی بەدەستەێنانی ئارەزووەکانتان هەوڵ بدەن گۆڕانکاریی لە خواستەکانتان بکەن، بە بڕواوە دەتوانن بگەن بەبەختەوەری ڕاستەقینە.

*****

- ژیانی رۆژێکی مرۆڤێکی زانا گەلێك باشتر و بەکەڵکترە، لە ژیانی سەد ساڵەی مرۆڤێك، کە بە نەزانی و رِك و کینە ژیاوە.

❊❊❊❊❊

**(بۆدلێر) شاعیری مەزنی فەرەنسایی**

- با تفەنگەکان بێدەنگ بن...شاعیرێك دەیەوێت بدوێ، با تفەنگەکان بێدەنگ بن...خونچەیەك دەیەوێت بپشکوێت، با تفەنگەکان بێدەنگ بن...منداڵێك دەیەوێت بنووێت.

❊❊❊❊❊

**(بیلّ گیتس) دامەزرێنەری کۆمپانیای مایکرۆسۆفتی ئەمەریکایی**

- کاتێك پارە لە دەستت دایە، تەنها خۆت ئەوەت بیر دەچێت کە تۆ کێیت، بەڵام کاتێك هیچ پارەیەکت نییە، هەموو دنیا بیری دەچێت کە تۆ کێیت“ ئەمەیە ژیان.

❊❊❊❊❊

- ئەگەر بەهەژاری لە دایك بوویت ئەوە هەڵەی تۆ نییە، بەڵام ئەگەر بەهەژاری مردیت ئەمەیان هەڵەی تۆیە.

❊❊❊❊❊

- ئافرەت ئەگەر دڵپیسی لێ بکەیت و ئازادی لێ وەربگریتەوە، ئەگەر چواردەورەکەشی بە پۆلیس گەمارۆ بدەی، ئەگەر کەسیشی دەست نەکەوێت لەگەڵ پۆلیسێك لەو پۆلیسانە هەر رێك دەکەوێت تاکو ناپاکیت لێ بکات.

❊❊❊❊❊

- مرۆڤە گەمژەکان ئەوانەن، کە لە یەکەم شکستدا دەستبەرداری ئامانجەکانیان دەبن، زۆری سەرکەوتنەکانی من هەر ئەوە بووە، کە لە پێناو ئامانجەکانمدا بەنێو ئاگریشدا رۆیشتووم.

*****

- مامۆستا هەرگیز ڕاستییەکەت پێ ناڵێت ئەو تەنها ڕێپیشاندەرە، ئاماژە بۆ ڕاستییەکان دەکات و هەر قوتابییەك دەبێت خۆی بیدۆزێتەوە.

*****

**(بینیامین فرانکلین) نووسەر و زانا و سیاسەتوانی ئەمەریکایی**

- بڕوا بە خۆبوون پیاوی هەژار دەکات بە دەوڵەمەند، نەبوونی بڕوا دەوڵەمەند دەکاتە هەژار.

*****

- ئاقڵەکان پێویستیان بە ئامۆژگاری نییە و دەبەنگەکانیش قبووڵی ناکەن.

*****

- بەدبەختی زۆرینەی مرۆڤەکان ئەوەیە، زوو پیر دەبن و درەنگ ژیر دەبن، بەڵام کەمیش نین ئەوانەی هەموو ژیانیان بە گەمژەیی بەسەر دەبەن و درەنگ پیر دەبن و درەنگ دەمرن.

*****

**(بێرتۆڵد برێخت) نووسەری ناوداری ئەڵمانیایی**

- لە مردن مەترسە، لەو ژیانە بترسە، کە بێ بەها بەڕێی دەکەیت.

*****

**(بیل کلینتۆن) سەرۆکی پێشووتری ئەمەریکا**

- هەموو سیاسەتمەدارێك لەو شەقە دەترسێت (هۆشیاربوونەوەی کۆمەڵگە)

*****

## (بەیدەبا) زانای مەزنی هیندستانیی

- سیّ شت هەن مەگەر گێل ئەگینا کەس بەلایاندا ناچێت، چونکە کەس بە سەلامەتی لێیان دەرناچێت ئەوانیش، هاورێیەتی پاشایان، درکاندنی نهێنی لای ژنان، خواردنەوەی ژەهر بۆ تاقیکردنەوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

## (بۆب مارلی) هونەرمەندی جامایکایی

- ئێوە دەڵێن بارانمان خۆشدەوێت، بەڵام چەترەکانتان هەڵدەدەن کاتێ باران دەبارێت، ئێوە دەڵێن خۆرمان خۆشدەوێت، بەڵام بەدوای سێبەردا دەگەڕێن کاتێ خۆر هەڵدێت، ئێوە دەڵێن (با)مان خۆشدەوێت، بەڵام پەنجەرەکانتان دادەخەن، کە (با) هەڵدەکات، هەر لەبەرئەوەشە من دەترسم، کە دەڵێن منیشتان خۆشدەوێت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

## (براون جاکسۆن) کۆمەڵناسی ئەمەریکایی

- هەوڵ بدە کارەکانت بە باشترین شێوە ئەنجام بدەیت، ئەگەر وا نەکەیت ئەوا فێڵ لە خۆت دەکەیت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ڕێز لە کەسی ڕاستگۆ بگرە، چونکە ئەوانە زۆر خووخدەیی چاکی دیکەیان هەیە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- لە بیرت نەچێت، دەنگ بەرزکردنەوە لە کاتی دەمەقاڵێدا، ئەگەری ئاشتبوونەوە کەم دەکاتەوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

## (بلزاک) ڕۆمانووسی بەناوبانگی فەرەنسایی

- نهێنی لە سنگی ئافرەت وەك تیر وایە لێی نەهاتە دەرەوە کوشتویەتی.

❊❊❊❊❊

- ئەقڵ و هۆش میرات نییە بۆت بمێنێتەوە، کوڕی زۆرینەی سەرکردە و گەورە پیاوان و بلیمەتان ئەقڵیان بوتڵێك شەراب ناکات.

❊❊❊❊❊

**(باراك ئۆباما) یەکەمین سەرەك کۆماری ڕەشپێستی ئەمەریکایی**

- مرۆڤی ئاقڵ هەر ئەوە نییە قسەی جوان بکات، بەڵکو ئەوەیە کرداری جوانی هەبێت و بزانێت چۆن دەژی، ئەگینا قوماربازە فێڵبازەکان لە هەموومان جوانتر قسەدەکەن!.

❊❊❊❊❊

# پیتی (پ)

## (پاولۆ کۆیلۆ) ڕۆماننووسی بەرازیلیی

• هەمیشە کەسێك هەیە لە جیهاندا، کە چاوەڕوانی کەسێکی دیکە دەکات، ئەگەر لە ناوەڕاستی بیاباندا بێت یان لە ناوەندی شارە گەورەکاندا.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

• لە دەستدانی هەر کەسێك کە خۆشمویستووە، ئازاربەخش بووە، ئەگەرچی تا ئێستەش باوەڕم وایە، کە کەس، کەس لەدەست نادات، چونکە کەس موڵکی کەس نییە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

• ئەمە ئەزموونی واقیعی ئازادییە، هەبوونی گرینگترین شتەکانی دنیا بە بێ ئەوەی خاوەنییان بی.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

• مرۆڤەکان بەبێ خۆشەویستی، لە ڕۆبۆتێك زیاترنین، ئەو ڕۆبۆتانەی مرۆڤەکان بەبێ دڵ دروستیان دەکەن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

• سەیرترین شتی دنیا لە تەمەنمدا بینیومە ئەوە بووە زۆرینەی ئەو مرۆڤانەی، کە مەزن و پاکیزە بوون بە تەنها ماونەتەوە..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

• تەنها شتێك کە دنیا پێویستیەتی، کەسانێکە کە دەتوانن خەونەکانی خۆیان بهێننە دی و بۆ بیروڕاکانیان بجەنگن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- راکردن لەجەنگ خراپترین شتە کە ڕوودەدات، خراپترە لە شکست، چونکە هەمیشە دەتوانین لە جەنگ شتێك فێربین، بەڵام ئەگەر رابکەین لە جەنگ تەنها سەرکەوتنی دوژمنمان ڕاگەیاندووە.

*****

- کاتێك لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەست بە گفتوگۆ دەکەین، شتگەلێك دەهێننە زمان، کە مرۆڤ نازانێت بە چ شێوەیەك بەردەوامی بە قسەکانی خۆی بدات.

*****

- ڕەنگە خوداوەند لەبەرئەوە بیابانی دروست کردبێت، بۆ ئەوەی هەر کەسێك بە بینینی دار خورما زەردەخەنەیەك بکات.

*****

- من دەتوانم بۆت ڕوون بکەمەوە، بەڵام ناتوانم لە جیاتی تۆش لێی تێبگەم.

*****

- بەڕوونکردنەوە، کاتی خۆت بەفیڕۆ مەدە، خەڵکی بەتەنها ئەوەیان گوێ لێدەبێت کە دەیانەوێت گوێیان لێی ببێت.

*****

- ئەگەر دەتەوێت ئاگرێك بکەیتەوە بۆ ڕووناکی و گەرمی، دەبێت بەرگەی دووکەڵە ناخۆشەکەی بگریت کاتێك هەناسەت دژوار دەکات و چاوانت پڕ دەکات لە فرمێسك.

*****

### (پابلۆ پیکاسۆ) نیگارکێشی ناوداری ئیسپانیایی

- ئەگەر ئاوێنە نەبوایە، هەموو کەس خۆی بەجوان دەهاتە پێش چاو.

*****

- حەقیقەتی ڕاستەقینە لە بێدەنگیدا شاراوەتەوە!.!..

❊❊❊❊❊

**(پیرەمێرد) شاعیری گەورەی کورد**

- لە مەیدانا کەس دەنگی دەرنایە، کە دوژمن شکا زۆر کەس ئازایە.

❊❊❊❊❊

- هیچ کەس مەناسە بە جلوبەرگی، بە زۆر وتنی یاخود بێ دەنگی، کردار تاقی کەرەوە ئەوسا بۆی دانێ قورسایی و سەنگی.

❊❊❊❊❊

- بۆ ئیش پێڵاوت لەسەر چاوانە، کە ئیشیان نەما ئێسکت گرانە.

❊❊❊❊❊

**(پۆل ڤالێری) شاعیر و نووسەری فەرەنسایی**

- باشترین هۆکار بۆ بەدەستهێنانی خەونەکانت، ئەوەیە کە هەستیت لە خەو.

❊❊❊❊❊

**(پریناز ئێزەدیار) دەرهێنەری ئێرانی**

- نەفرەت لە هەموو یاساکانی دنیا، کە لە هیچ کامیاندا، دڵ شکاندن تاوان نییە!..

❊❊❊❊❊

**(پاسکاڵ) فەیلەسووف و فیزیکزانی فەرەنسایی**

- هەموو گرفتەکانی مرۆڤ لەوەدایە کە ناتوانێت بێدەنگ بێت.

❊❊❊❊❊

**(پەندێکی چینی)**

- لە هێدی ڕۆیشتن مەترسە، لە وەستان بترسە.

❊❊❊❊❊

- شەو هەرچەندە شەوەزەنگ و تاریك بێت، ناتوانێت ڕووناکی مۆمێك بکوژێنێتەوە.

❊❊❊❊❊

**(پاپلۆ نیرۆدا) شاعیری چیلی**

- خەڵکی ئاشقی موڵك و ماڵن، کەچی من حەز دەکەم تەنها سەیری بکەم!.

❊❊❊❊❊

**(پۆڵ بریمەر) حاکمی مەدەنی عێراق ئەمەریکایی**

- مام جەلال پێی وتم هیچ هێزێك لە دنیادا جگە لە مێزێکی پڕ لە پارە ناتوانێت هەموو سیاسی و سەرکردەکانی عێراق و کوردستان لە دەوری یەك کۆبکاتەوە، پێشنیازەکەیان بەهەند وەرگرت و هەرواش دەرچوو.

❊❊❊❊❊

پیتی ( ت )

**(تۆڵستۆی) ڕۆماننووسی مەزنیی ڕووسیایی**

- وشەکانت بەرز بکەرەوە نەك دەنگت، ئەوەی کە گوڵەکان گەورە دەکات بارانە نەك هەورە تریشقە.

❊❊❊❊❊

- من ڕاستییەکی مرۆڤت پێدەڵێم، کە هەرگیز شکست ناخۆی لە ناسینیان هەموو کەسێکت خۆشبووێ، بەڵام بڕوا بە هەموو کەسێکیش مەکە.

❊❊❊❊❊

- ئەرکی یەکەمی مرۆڤ هەر ئەوەیە، کە سەرەتا بیر لە خۆناسینی خۆی بکاتەوە دواتر ناسینی کەسانی دیکە.

❊❊❊❊❊

- خراپترین و مەترسیدارترین وشە ئەوەیە، کە بڵێین هەمووان وەك یەکن و هەمووان وان.

❊❊❊❊❊

- ئافرەتی جوان کامەرانییە بۆ چاو، دۆزەخە بۆ گیان، پاککەرەوەیە بۆ گیرفان.

❊❊❊❊❊

- چاکە شکست بە هەموو شت دێنێت و خۆی شکست ناخوات.

❊❊❊❊❊

**(تۆماس ئەدیسۆن) زانا و داهێنەری گڵۆپ و کامێرایی ئەمەریکایی**

- هەرگیز نمرە نابێتە پێوانە بۆ زیرەکی کەسێك و هەرگیز تەمەنیش پێناسەی زیرەکی کەسەکان ناکات.

❊❊❊❊❊

- ئەگەر بەیانی تاقیکردنەوەم هەبێ و نەشم خوێند بێ، هیچ خەم ناخۆم، چونکە تاکە کاغەزێك ناتوانێت بڕیار لەسەر داهاتووم بدات.
- من هەرگیز نالێم شکستم خواردووە، بەڵکو هەمیشە گووتومە زۆرترین ڕێگەم بۆ چارەسەری شکستەکانم دۆزیوەتەوە.

❊❊❊❊❊

**(تورکی ئەلحەمەد) هزرڤان و ڕۆماننووسی سعودیایی**

- سەیرە خودا بەو گەورەییەی خۆی بەدوای بچووکترین هۆکاردا دەگەڕێ تا لێمان خۆشبێت و بمانخاتە بەر ڕەحمەتی خۆی، بەڵام ئەوانەی بە ناوی خوداوە قسە

دەکەن بە دوای بچووکترین هۆکاردا دەگەڕێن تا کافرت بکەن و لە ڕەحمی وی بێبەشت بکەن!.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(تەنیا محەمەد) شاعیر و نووسەری کورد**

- ڕووخسارت لە مانگ دزیوە و ناخت لە پیسیەکانی بەشەریەت!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- واتان لێکردین لە ئێستەدا بڵێین هەلاَتن لە نیشتمان ئەرکێکی نیشتمانییە!.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ئەوانەی سەرکردەکان وەك باوکی خۆیان ناودەبەن، لە ڕاستیدا گەورەیی دایکی خۆیان دەخەنە ژێر پرسیار!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- کەسی وا باسی ئەخلاقت بۆ دەکا، هەر پێت خۆشە بێ ئەخلاق بیت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(تۆفیق ئەلحەکیم) نووسەر و ڕووناکبیری میسریی**

- باوکم سیاسەتمەدار بوو هەتا مردیش دایکم باوەڕی پێ نەدەکرد کاتێك دەیگوت خۆشمدەوێی!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- زۆرن ئەوانەی بە ناوی خێرکردنەوە ئابڕو بەخەڵکی هەژار و لێقەوماوان ناهێڵن و بەجۆرێك پێیان دەبەخشن، کە لە ڕوویان نەیێت تا ماوەیەك بێنە ناو خەڵك.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(تۆماس فولەر) پزیشکی ناوداری ئەمەریکایی**

- ئافرەتان چین؟، وەك دەڵێن چەندە جوانن، هێندەش بێ ئەقڵن، ئەگەر ئەقڵیان هەبووایە ئەوا فەرمانڕەوایی هەموو جیهانیان دەکرد.

**(توپاك) هونەرمەندی ئەمەریکایی**

- بەو پێیەی دەسەڵات هەمیشە بە سکێکی تێرەوە لەبارەی ژیانی کۆمەڵگە قسان دەکات، کەواتە دەبێت دەستبەرداری ئەو خەونە ببین، کە ژیانی هەژاران لەوە باشتر دەبێت، بۆیە تکام وایە هەر کەسێکمان لە جێگەی خۆیەوە دەستی چەند هەژارێك بگرێت هیچ نەبێت با هۆکار بین بۆ هاتنەدی خەونێکیان.

❊❊❊❊❊

- لەم جیهانەدا کەسانێکی زۆر، بێ ڕەوشت و هیچ و پووچ هەن، بەڵام ئاگەداری ئەوەبە بەر لەوەی سەرزەنشتیان بکەی لەوە دڵنیا ببەوە، کە خۆت یەکێك نیت لەوان.

❊❊❊❊❊

**(توماس کارلیل) وتارنووسی ئوسکتلەندی**

- ئازایەتی ڕاستەقینەی مرۆڤ لەوەدا نییە، بە شێوەیەکی شەرەفمەندانە بمرێت، بەڵکو لەوەدایە مرۆڤ بە شێوەیەکی ئازایانە بژی.

❊❊❊❊❊

**(تراسیماخۆس) فەیلەسووفی یۆنان**

- هەرچینێکی فەرمانڕەوا یاساگەلێك دادەڕێژێ، کە لە بەرژەوەندیی خۆیدا بێت.

❊❊❊❊❊

## پیتی (ج)

**(جوبران خەلیل جوبران) شاعیر و نووسەری لوبنانی**

- ولاّتێك كە رەنگی لافیتەی مردووەكانیشی بۆنی حزبایەتی لیّ بیّت، هەر بۆ ئەوە باشە لە هەندەرانەوە شیعری بە بالاّدا هەلّبدەیت!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ئەگەر بینیت هەمووان پیّچەوانەی تۆ دەڕۆن، دوودلّ مەبە بەردەوامبە لە رۆیشتن، تەنانەت ئەگەر بە تەنهاش مایتەوە، تەنیایی زۆر باشترە لەوەی پیّچەوانەی خۆت بژیت لە پیّناو بەدەستەیّنانی كەسانی دیكەدا.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- بیّ دەنگی لە زۆر رەوەكانەوە فیّربووم، ئارام گرتن لە بیّ ئارامەكانەوە فیّربووم، میەرەبانی لە دلە رەقەكانەوە، ئیّستەش سەیرە كە سوپاسگوزاری ئەو مامۆستایانە نیم.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- لە سەر دەرگەی مالّەكەمم نووسی، تكایە دووڕوویەكەت لە دەرەوە دابنیّ ئەوسا وەرە ژووریّ، ئیدی لەو كاتەوە كەس سەردانی نەكردم.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(جۆرج ئۆریوڵ) نووسەر و ڕۆژنامەنووسی بەریتانیایی**

- سیاسەت، هیچ نییە، جگە لە كۆمەلّیّ درۆ و دەلەسە، خۆبوواردن، گەوجیّتی، ڕكوكینە و شیزۆفرینیا..

* * * * *

- زۆرینەی سیاسەتمەدارەکان لە سەرەتادا خوێڕی و سەرسەری و شەقاوەی سەر جادەکان بوون، کاتێکیش دەبن بە سیاسەتمەدار هەمان خوێڕی و سەرسەری و شەقاوەی پێشوون بەڵام لە بەرگێکی پۆشتەدا.

* * * * *

- لە ڕۆژگارێکدا، کە درۆ دەبێتە واقیعێکی گشتی، ئەوا درکاندنی ڕاستی دەبێتە کردەیەکی شۆڕشگێڕانە!...

* * * * *

- زمانی سیاسەت بەجۆرێك داڕێژراوە، کە تێیدا درۆکردن وەك هەقیقەت و ڕاستگۆیی دەردەخات و کوشتنیش وەك کارێکی بەڕێز.

* * * * *

**(جۆرج هێربێرت) هزرڤان و ڕۆژنامەنووسی بەریتانیایی**

- وشە و قسەی باش بەهایەکی زۆریان هەیە و تێچوونێکی کەمیان هەیە.

* * * * *

**(جەلال تالەبانی) سەرۆك کۆماری عێراقی فیدراڵ.**

- هەر سەرکردەیەك زۆر چەپڵەی بۆ لێدرا، بە فیکە و چەقەنە لێدانیش تابووتەکەی بەڕێ دەکرێت، چونکە جەماوەری ڕاستەقینە چەپڵە لێ نادات ڕەخنە دەگرێت.

* * * * *

- ئەوەی دوو دینار وەرنەگرێت بایی دینارێك بەشان و باڵی دەسەڵاتدا هەڵناڵێت، ئەوە شتێکە من ناتوانم نکۆڵی لێ بکەم، لە هەموو دنیاش بەو جۆرەیە ئەوانەی بەدوایی دەسەڵاتەوەن مەسەلەکە تەنها دوو دینارە.

* * * * *

**(جیم کویك) شاعیر و نووسەری ئێرلەندیایی**

- ئەگەر هێلکە لە دەرەوە هێزێك بیشکێنێت، ئەوا ژیانی کۆتایی دێت، بەڵام ئەگەر لە ناوەوە هێزێك بیشکێنێت ئەوا ژیانی دەست پێ دەکات، باشترین بیرۆکە ئەوەیە هەمیشە لە ناوەوە خۆمان شتەکان بشکێنین.

* * * * *

**(جاکس فریسکۆ) فەیلەسووف و نووسەری ئەمەریکایی**

- لێیان پرسیم: تۆ پیاوێکی ژیری بۆچی دەوڵەمەند نیت؟ لە وەڵامدا وتم: تۆش پیاوێکی دەوڵەمەندی بۆچی ژیر نیت؟!.

* * * * *

**(جۆن لینۆن) شاعیرو گیتارژەنی بەریتانیایی**

- ئێمە لە جیهانێك دا دەژین، کە بۆ خۆشەویستی کردن دەبێ خۆمان حەشار بدەین، لە حاڵێکدا کە توندوتیژی بە ئاشکرا و ڕۆژی ڕووناك ئەنجام دەدرێ!...

* * * * *

**(جۆن لۆك) فەیلەسووف و هزڤانی بەریتانیایی**

- مێشك ئەو جێگایەیە، کە دەتوانێت خودی خۆت و مرۆڤەکان لە بەهەشتەوە بەرەو دۆزەخ و لە دۆزەخەوە بەرەو بەهەشت ڕەوانە بکات.

* * * * *

**(جەواهیر لال نەهرۆ) یەکەم سەرۆك وەزیرانی هیندستان**

- گیرفانی بەتاڵ ڕێی لە کەس نەگرتووە بۆ ئەوەی نەگات بە سەرکەوتن، بەڵکو ئەقڵی بەتاڵ و دڵی وێرانەن، کە ئەم کارە دەکەن.

* * * * *

- کاتێك بیر لە ئامانجەکان دەکەینەوە، نابێت هۆکارەکان لە یاد بکەین.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(جۆن داڤیس) پارێزەری ئەمەریکایی**

- ئێوە بە من پێدەکەنن لەبەرئەوەی جیاوازم لە ئێوە، منیش بە ئێوە پێدەکەنم، چونکە هەمووتان وەکو یەکن!...

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(جۆن کەنەدی) سەرۆکی پێشوتری تیرۆرکراوی ئەمریکایی**

- هەموو دایکێك حەز دەکات کوڕەکەی ببێت بە سەرۆك، بەڵام هیچیان حەز ناکەن کوڕەکانیان ببن بە سیاسەتمەدار.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- تا رادەیەك ئاساییە هاووڵاتییەك درۆ لەگەڵ هاووڵاتییەکی دیکەدا بکات، بەڵام کارەساتە سیاسی درۆ لەگەڵ تەواوی هاووڵاتیاندا دەکات و هاووڵاتیانیش بەئاسایی وەری دەگرن و ناوی دەنێن سیاسەت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- سەیر لەوەدایە سەرکەوتن لەپڕێکدا هەزار و یەك باوکی بۆ دروست دەبێ، بەڵام شکست وەك هەتیوێکە کەس خۆی ناکاتە خاوەنی.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- لە (جۆن میلتۆن)ی شاعیری بەناوبانگی بەریتانیایی دەپرسن: بۆچی پاشا لەبەریتانیادا لە چواردە ساڵییەوە دەتوانێت ببێت بە پاشا، بەڵام بۆ تا هەژدە ساڵ تەواو نەکات ناتوانێت و بۆی نییە ژن بهێنێت؟. (جۆن میلتۆن) لە وەڵامدا دەڵێت: چونکە بەڕێوەبردنی وڵاتێك زۆر ئاسانترە لە بەڕێوەبردن و ڕاگرتنی دڵی ژنێك!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**( جۆمۆ كنیاتا) یەكەمین سەرۆك كۆماری كینیایی**

- ئەوە خەڵكە سەرۆك و سیاسییەكان دەكەن بە درۆزنێكی نمرە یەك و دیكتاتۆرێكی كارامە، من كاتێك دەچوومە ناو خەڵك و قسەم بۆ دەكردن بە جۆرێك هوتافیان دەكێشا و چەپڵەیان لێدەدا هەر بەزۆر ڕاپێچیان دەكردم بۆ درۆكردن، چونكە چەپڵە و پێدا هەڵگوتن خۆشییەكی تایبەت دروست دەكات، جا بۆ بەردەوامبوونی ئەو گڕوتینە ناچاری سەری درۆ و دەلەسە ئاوالاّ بكەی.

* * * * *

- لە ماوەی ئەو چەندین ساڵەی سەرۆكایەتیم كرد، تێگەیشتم لایەنگری كۆمەڵگە بۆ سەرۆك و حزب بەسەر سێ بەش دابەش بووە، بەشێكیان لە ترسان و بۆ مانەوەی خۆی پێتدا هەڵدەدات، بەشێكیشیان بۆ پڕكردنی گیرفان و خۆبردنە پێشەوە بۆ دەسەڵات، بەشەكەی دیكەشیان لە خەڵەفاوی و نەزانیدا.

* * * * *

**(جەلال عامر) نووسەر و ڕۆژنامەنووسی میسری**

- نەخۆشخانە تایبەتەكان، ئەو شوێنەیە، كە هاوولاّتییان پارەكانیان تێیدا خەرج دەكەن، نەخۆشخانە گشتییەكانیش، ئەو شوێنانەن، كە هاوولاّتییان ژیانیان تێیدا خەرج دەكەن..

* * * * *

**(جەمال غەمبار) شاعیری كورد**

- ئەگەر نەتوانین دەرگەكان بكەینەوە، هەر نەبێت وەرن وێنەی [illegible]كان بە كراوەیی بكێشین..

* * * * *

**(جۆن دی وی) فەیلەسووف و دەروناسیی ئەمەریکایی**

- قوولّترین پاڵنەر لە سروشتی مرۆڤەکاندا ئەوەیە هەست بە گرینگی خۆیان بکەن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(جینس جویلین) هونەرمەندی بەناوبانگی ئەمەریکایی**

- ڕازی نەبیت بەخۆت کەوا بزانیت هەر ئەوەندە توانایەت هەیە، کە بەدەستت هێناوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(جۆنی دێب) ئەکتەری ئەمەریکایی**

- پێویست ناکات جیهان بۆ خۆشەویستەکەت بکڕیت، تەنها دڵتی لێ مەفرۆشە بەسە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

## پیتی (چ)

**(چارلز بۆکۆفسکی) شاعیر و نووسەر و چیرۆکنووسی ئەڵمانیایی**

- تەنیا گەمژەکانن پێدەکەنن، لە کاتێکدا، کە هیچ هۆکارێك نییە بۆ پێکەنین.

*****

- جیاوازی نێوان دیموکراسی و دیکتاتۆری ئەوەیە، لە دیموکراسیدا یەکەجار دەنگ دەدەیت پاشان فەرمانەکان جێبەجێ دەکەیت، لە دیکتاتۆریدا پێویست ناکات کاتی خۆت بە دەنگدانەوە بەفیڕۆ بدەیت!.

*****

- ژیانی من، هەڵبژاردنەکانی من، هەڵەکانی من، کێشەکانی من، تەنیایی من، یانی بە کورتی پێوەندیی بە ئێوەوە نییە!..

*****

- خۆزگە مرۆڤ کەمینە دەبوو، نەك دیاردەیەکی لەو چەشنە بێ ڕەوشت، کە هەموو شتێکی لێ چاوەڕێ دەکرێت، جگە لە کردەوەی باش.

*****

- لە کاتێکدا کە بڕیار نییە تۆ بەرپرسی هەڵە و گوناهـ و تاوانەکانی من بیت ئەی بەچ هەقێك خۆت لە ژیانی تایبەتیم هەڵدەقورتێنی؟.

*****

- هەموو ئەو شتانەی ئێوە بە نەنگی دەزانن، کەچی بەدزییەوە دەیانکەن، من بە ئاشکرا ئەنجامیان دەدەم، پێم وا بێت ئەوەی پێی دەڵێن ئەخلاق هەر ئەوەی منە.

* * * * *

- چ شتێکی هاوبەش لە نێوان مرۆڤەکاندا هەیە یانی شتێك، کە هەمووان هەیان بێت، (گێلی، درۆ، خۆبەزلزانی).

* * * * *

- لێم دەپرسن داخۆ بۆ هێندە ئاشقی (مەی، جگەرە و سێکس)م؟، منیش دەپرسم مەگەر شەڕی ئێوە لەسەر کامانەن بۆ ئەم دنیایە؟.

* * * * *

- زۆرن ئەو پیاوانەی دەزانن، کە هاوسەرەکانیان لەبەر گیرفانەکانیان شوویان پێکردوون، نەك لەبەر کەسایەتییەکەیان، بەڵام بەهۆی جوانی ژنەکانیانەوە چاوپۆشی لەو ڕاستییە دەکەن، ئەوەش بەدبەختییەکی دیکەی پیاوانە، کە هەموو ڕاستییەك دەکەنە قوربانی چێژێکی سێکسی.

* * * * *

- جوانییەکی دیکەی ئاژەڵ و باڵندەکان، زمانی قسەکردنیان نییە، تا لە چەشنی مرۆڤەکان درۆ بکەن.

* * * * *

- دەبێت باوەڕ بکەیت کۆمەڵێك مرۆڤ پەیدا دەبن بە بێ هیچ خەمێك، بەخۆشییەوە ژیان دەکەن، جلی جوان لەبەر دەکەن، شتی خۆش دەخۆن، باش دەخەون، چێژ لە ژیانی خێزانی دەبەن، بڕێك جاریش دڵتەنگ دەبن، بەس گوێی نادەنێ زۆرینەی کات حاڵیان باشە، کاتێکیش دەمرن زۆر بەئاسانی دەمرن، یانی لەکاتی خەودا دەمرن.

* * * * *

- تەنیا شتی جوانی سەر زەوی ئاژەڵەکانییەتی، کە خەریکە ئەوانیش بە کۆمەڵ دەکوژرێن.

＊＊＊＊＊

- یەکجار بە ئەخلاق بووم، نیوەی دەوروبەرەکەمم لە دەستدا!..

＊＊＊＊＊

- کێشەی جیهان لەوەدایە، کە مرۆڤە زیرەکەکان پڕن لە گومان، لە کاتێکدا مرۆڤە گەمژەکان لێوان لێون لە دڵنیایی.

＊＊＊＊＊

- هەندێك شت هەیە زۆر خراپترە لە تەنیایی بەڵام چەندین ساڵی دەوێ تاکو تێبگەیی، بەڵام ئەوکاتیش کە تێدەگەیی ئیتر زۆر درەنگە هیچ شتێك لە زۆر درەنگ کەوتن خراپتر نییە.

＊＊＊＊＊

- گرفتی گەورەی زۆرێك لە خەڵك ئەوەیە، بەبێ هیچ شتێك خۆیان بەلاوە گرینگە و گرینگ نین، هەندێکجار بە جۆرێك هەڵسوکەوت دەکەن، ئەگەر جگە لە ئێمە مرۆڤگەلێکی دیکە هەبووایە وایان دەزانی ئەوانە ئافرێنەری گەردوون و هەموو بوونەوەرانن، لە ڕاستیدا ئەو جۆرە خۆ بەگەورە زانینە لە بۆشی ئەقڵییانە، چونکە مرۆڤی ئاقڵ و تێگەیشتوو بە ئاسایی هەڵسوکەوت دەکات.

＊＊＊＊＊

- سۆزانی تەنها کەسێك نییە، کە جەستەی خۆی دەفرۆشێت، ئەوانەی جەستەش دەکڕن سۆزانین!..
- جۆرە گەمژانێکیش لە کۆمەڵگەدا هەن هەموو جۆرە بێ ئەخلاقییەکیان بۆ خۆیان پێ ڕەوایە و بۆ کەسانی دیش بە کوفری دەزانن.

＊＊＊＊＊

**(چارلز ئێچ فۆلەر) ئەندازیاری تەلارسازی بەریتانیایی**

- باشترین مامۆستای مرۆڤ ژیانی خەڵکانی گەورەیە.

❊❊❊❊❊

**(چارلی چاپلن) ئەکتەری کۆمیدی بەریتانیایی**

- دوو جۆر سیاسەتمەدار بوونیان هەیە، جۆری یەکەمیان ئەوانەن، کە تەنها درۆ دەکەن و جۆری دووەمیشیان ئەوانەن، کە ڕاستی نالێن!..

❊❊❊❊❊

- ئەگەر دەوڵەمەندان بیانزانیایە ناخی هەر هەژارێك پڕیەتی لە بەخشندەیی و خۆشەویستی، هەرگیز خۆزگەیان بۆ پارە نەدەخوارد، تا دەوڵەمەندیان بکات.

❊❊❊❊❊

- ئەو کەسانەی بە (بەرد) دەڵێن ڕەقە، تا ئێستە مرۆڤەکانیان بە تەواوی نەناسیوە!..

❊❊❊❊❊

- مرۆڤ بەو دڵپاك و خاوەن ویژدانبە، چونکە مرۆڤ سواڵ بکات و برسی و ڕووت و ڕەجاڵ بێ، لەوە باشترە بێ بەزەیی و نەفس نزم بێ.

❊❊❊❊❊

- من نیگەرانم لە مرۆڤان، کاتێك لەتاو ئازارەکانم دەگریام پێیان دەگوتم لاواز، کاتێك بێدەنگ دەبووم بە شێت و گۆشەگیر ناو دەبرام، لەکۆتایدا ویستم لە ڕێگەی شانۆ و فیلمەوە ئازارەکانم بگەیێنم، کەچی هەمووان پێم پێکەنین!..

❊❊❊❊❊

- کۆمەڵگە دوو شتی بۆ لەبیر ناکرێت، مردنی دەوڵەمەند و هەڵەی ئینسانی هەژار.

❊❊❊❊❊

- شەرمەزار بن ئەو ژن و مێردەی، کە بە سەرزاری، خۆشەویستی یەکترین و لە دڵدا لە یەکدی بێزارن.

- نیوەی خەڵکی بە زمانیان درۆ دەکەن، بەڵام نیوەی دیکەیان بە فرمێسکەکانیان.

❊❊❊❊❊

- هەمیشە میهرەبانترین کەسەکان خراپترین مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ.

❊❊❊❊❊

- ئێمە هێندەی پێویستیمان بە مرۆڤایەتی هەیە، هێندە پێویستیمان بە داهێنان نییە.

❊❊❊❊❊

- چەند جێگەی داخە من بە گریانەوە دەنووسم، بە پێکەنینەوە دەیخوێننەوە!..

❊❊❊❊❊

- من لە ژیانمدا چەندین کێشەم هەیە، بەڵام لێوەکانم ئەوە نازانن هەمیشە پێدەکەنن!..

❊❊❊❊❊

- من لەگەڵ خودایا سازم، گەورەترین کێشەم لەگەڵ مرۆڤەکانە، هەندێ کات لەسەر شانۆ بۆ ئەوەی، کە بۆ یەك چرکە بزە بخەمە سەرلێوی بینەر، خۆم چەندین کاتژمێر گریاوم !. بەداخەوە هەتا وەکو سەرەمەرگیش ئەوان لە من تێنەگەیشتن و هەر پێدەکەنین.

❊❊❊❊❊

- تەنها بە یەك شێوە دەمێنمەوە، یەك شێوە و بەس، ئەویش گاڵتەجارییە، ئەو شێوە ژیانە من لە ئاستێکی زۆر بەرزترا دادەنێت لە هەر سیاسەتوانێك.

* * * * *

- برسیەتی ویژدانی نییە.

* * * * *

- لەخۆبایی بوون، پێش ئەوەی باڵ بە مرۆڤ ببەخشێت قاچەکانی ئەشکێنێت.

* * * * *

- هاوڕێیەتی سەگێك باشترە لەوەی دۆستێکی ناپیاو و نامەردت هەبێت.
- لە (چارلی چاپلن)یان پرسی ژنی چەنەبازت خۆش دەوێ؟، لە وەڵامدا وتی: بۆ ژن جۆری دیکەیشی هەیە؟.

* * * * *

- ئافرەت و سەگ و منداڵ باشترین ئەکتەری سینەمان.

* * * * *

- من فریشتە نەبووم، بەڵام تا ئەو شوێنەی لە توانامدا بوو هەوڵمدا (مرۆڤ)بووم، تۆش هەوڵبدە کە(مرۆڤ) بیت.

* * * * *

- پیاوی ژیر و ڕۆشنبیر، هەرگیز جوانترین کچی لە جیهاندا خۆشناوێت، بەڵکو ئاشقی کچێك دەبێت جوانترین جیهانی بۆ دروست بکات، گەمژەکان جوانی ڕووکەشیان خۆشدەوێت و ئاقڵەکانیش جوانی کەسایەتی.

* * * * *

**(چارلز دیکنز) ڕۆماننووسی بەریتانیایی**

- ئەگەر دەتەوێت بزانیت خودا چەند پارە و پولی بەلاوە بێ نرخە، تەنها سەیرکە و بزانە بە چ کەسانێکی داوە!.

*****

- خاوەنی دڵێکبە، کە هەرگیز رەقی بەرد بەخۆیەوە نەگرێ و هەستێکیشت هەبێت، کە هەرگیز ئازاردەر نەبێت.

*****

- ئۆف لە دەستی ژنەکان ئێمە هەرچی دەڵێین ئەوان بە پێچەوانەوە ئەنجامی دەدەن، من بە ژنەکەم دەڵێم: با بڕۆین بە دەوری هەموو دنیادا بگەڕێین دەڵێت نا "با بڕۆین بۆ شوێنێکی دیکە"!.

*****

**(چیخۆف) چیڕۆکنووسی بەناوبانگی ڕووسیایی**

- باوکم هەموو جارێك دەیگوت: ئەگەر لە کاتی سەرەمەرگدا پێنج هاوڕێی باش لە دەورتدا بوو ئەوا تۆ ژیانێکی شەرەفمەندانەت هەبووە.

*****

- لەناو هەموو بوونەوەرە زیندووەکانی ئەم گەردوونەدا تەنها مرۆڤ ئەو بوونەوەرەیە، کە خۆی باوەڕ بە درۆکانی خۆی دەهێنێت.

*****

- ژیان زیندانێکی بەسۆیە، کاتێك مرۆڤ پێ دەگات و عەقڵی گەشە دەکات، هەر لە خۆیەوە ئیدی هەست دەکات، کە بووە بە تەڵەیەکەوە، کە ئیدی هیچ ڕزگاربوونی نییە!...

*****

- ژنان، زوو فێری زمانە جیاواز و بێگانەکان دەبن، چونکە لە مێشکیاندا بەتاڵایی زۆر هەیە.

✽✽✽✽✽

**(چارلی ئادەم) ئەندازیاری دەنگیی ئەمەریکایی**

- بۆ ئەوەی لای کچان کوڕێکی سەرنجڕاکێش بیت، پێویستە زۆرترین درۆ بزانیت و گیرفانیشت بڕێکی باش پارەی تێدا بێت، کچان هەمیشە ئەو کوڕانەیان خۆشدەوێت، کە گەمژەن.

✽✽✽✽✽

## پیتی (ح)

**(حوسێن پەناهی) شاعیری ناوداری ئێران**

- لەژێر ئاسمانی ئەم نیشتمانەدا، تەنها مەرگ بەیەکسانی دابەش دەکرێت.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

- منداڵیم خۆشدەویست رۆژانێك، کە لە جیاتی دڵم، سەر ئەژنۆکانم بریندار دەبوون.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

- مەرگ تەنها مردن نییە، مەرگ تەنها هەناسە هەڵنەکێشان نییە، من مردووی زۆرم بینیوە، کە بە رێگەدا دەرۆیشتن قسەیان دەکرد، جگەرەیان دەکێشا، لە تەڕبوونی ژێر باران و تەنیایی تێ دەگەیشتن، شیعریان دەگوت، دەگریان، قەرزیان دەکرد و قەرزیشیان دەدا، پێدەکەنین و دیسان دەگریان!.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

- ناچم بۆ بەهەشت، ئەگەر دایکم لەوێ نەبێت.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

**(حەسەنی بەسری) زانای سونەی سعودیا**

- هەموو ئوومەتێك بتی هەیە، بتی ئوومەتی محەمەد (د.خ) دینار و درهەمە.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

## پیتی (خ)

### (خۆسیە مۆخیکا) سەرۆکی ئۆرگوای

- سەرۆکی ئاقڵ بیر لە دواهاتوو دەکاتەوە، سەرۆکی گێلیش بیر لە کورسی.

٭٭٭٭٭

- منیش خەونی زۆرم هەیە، بەڵام لەبەر بەدیهێنانی خەونی خەڵکەکەم، جاریٚ خەونەکانی خۆمم لە بار بردوون!..

٭٭٭٭٭

- هەموو سیاسەتمەدارێك خەون بە شەڕەوە دەبینێت بۆ ئەوەی پێی بگوترێت پاڵەوان، ئەگەر لە حاڵێکدا هیچ وڵاتێکی دەست نەکەوت پەلاماری بدات ئەوە شەڕی ناوخۆ هەڵدەگیرسێنێت.

٭٭٭٭٭

- من خۆشەویستی بە پارە ناگۆڕمەوە، لە بەرامبەر سادەییم و خزمەتکردنی گەلەکەم، ئەوانیش خۆشەویستی و ڕێزیان پێبەخشیوم ئەوە سامانە گەورەکەی منە، پارە لەگەڵ مردنت کۆتایی دێت، بەڵام خۆشەویستی گەلەکەت لە مێژوودا دەنووسرێتەوە.

٭٭٭٭٭

### (خوارزمی) زانای بیرکاری ئێران

- ئەگەر مرۆڤ خاوەنی رەوشت بوو، ئەوا = ١، ئەگەر مرۆڤ جوان بوو ئەوا سفرێکی بۆ زیاد بکە = ١٠، ئەگەر خاوەن ماڵ و سامان بوو ئەوا سفرێکی دیکەیشی بۆ زیاد بکە = ١٠٠، ئەگەر خاوەنی خانەوادەیەکی باش و ناسراو بوو

ئەوا سفرێکی دیکەیشی بۆ زیاد بکە = ١٠٠٠، ئەگەر ژمارە ١، لابدەین (ئەخلاق) ئەوا بەهای مرۆڤایەتی نامێنێت و بەس سفرەکان دەمێننەوە!..

*****

**(خومەینی) یەکەم ڕابەری شۆڕشی ئیسلامی ئێران**

- هەر کەسێك لە کاتی ناشتنی تەرمەکەی لە تابوتەکەی کەوتە خوارەوە ئەوە نیشانەیە بۆ ئەوەی لە ئەهلی دۆزەخە.

*****

**(خەییام) شاعیر و گەردوونناسی ئێران**

- هیچ کەس بە نهێنی ئەشق نەگەیشتووە، ئەوەیش کە گەیشتووە، وا هەنووکە سەرگەردانە.

*****

- گەر مرۆڤ هەموو هەڵەکانی خۆی بزانێت، شێت دەبێت.

*****

## پیتی (د)

### (دۆستۆڤیسکی) ڕۆماننووسی ڕووسیایی

- زیرەکترین مرۆڤەکان لای من ئەوانەن، کە بە خۆیان دەڵێن گێل، بەلایەنی کەمەوە لە مانگێکدا جارێك.

❊❊❊❊❊

- گەر توانیت دڵێك لە شکان بپاریزیت، بۆ هەمیشە بەخۆت بڵێ مرۆڤی مەزن، بەڵام گەر شکاندت، بۆ هەمیشە تۆ بچووکی.

❊❊❊❊❊

- هەمیشە ئازار و چەرمەسەرییەکان لە یادەوەریەکانماندا دەمێنێتەوە، بەڵام چەند زوو شادی و خۆشییەکان لە بیردەکەین.

❊❊❊❊❊

- هەندێ شت هەیە نابێ بیانڵێین، مەگەر بۆ هاوڕێکانمان، هەندێ شت هەیە نابێ بیانڵێین، تەنانەت بۆ هاوڕێکانیشمان، لە کۆتاییدا هەندێ شت هەیە نابێ بوترێت تەنانەت لەگەڵ خۆشت دا.

❊❊❊❊❊

- ڕاست بێت یان هەڵە، زۆر خۆش و سەرنجڕاکێشە مرۆڤ جار جارە شتێك بشکێنێت.

❊❊❊❊❊

- پاڵنەری ڕەوشت سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ لایەنی ڕۆحی کەسەکەوە نەك ئەقڵی ئەو.

❊❊❊❊❊

- من حەزدەکەم گرفت و کێشە لە ژیانمدا زۆربێت بۆ ئەوەی بزانم چۆن دەتوانم بەسەریاندا زاڵ ببم.

*****

- ئەگەر تۆ بیروباوەڕی نەمری لە مرۆڤایەتیدا تێك بشکێنیت، نەك تەنها خۆشەویستی، بەڵکو هەموو هێزە زیندووەکان کە بەردەوامی بە ژیان دەبەخشن، ئەوا هەموو بە جارێك وشك دەبن.

*****

- لە هەموو جێگەیەك و لە هەموو ئیشێکدا تا کۆتاییەکەی بۆ پێشەوە دەچم، لە ژیاندا هەمیشە هێڵی کۆتاییم بڕیوە.

*****

- هەموو شتێك جگە لە مرۆڤ، کاملە و تەواوە.

*****

- لەناو هەر مرۆڤێك دا بوونەوەرێکی دڕندە هێلانەی کردووە.

*****

- ئاژەڵەکان بە هیچ شێوەیەك ناتوانن ئەوەندەی مرۆڤ بێ بەزەیی و زاڵم بن و کارامەیی و لێهاتوویەکی بەم شێوەیە لە بێ بەزەییدا بنوێنن.

*****

- هەژاری هەڵەیەکی کاتییە، بەڵام دەوڵەمەندی بێ ئەندازە نەخۆشییەکی کۆنی بێ چارەیە!...

*****

**(داروین) سرووشتناسی بەریتانیایی**

- مرۆڤەکان ڕاهاتوون، شتێك کە لێی تێنەگەیشتن گاڵتەی پێ بکەن.

*****

- خۆ من ئاژەڵ نیم، هەر کەسێك کە بیەوێت کوێرانە شوێنی بکەوم.

❊❊❊❊❊

**(دیکارت) پێشەنگی فەلسەفەی نوێی فەرەنسایی**

- لە جیاتی زاڵبوون بەسەر جیهاندا، بەسەرخۆتاندا زاڵبن.

❊❊❊❊❊

- تا ئەو کاتەی تاك خۆی بیر نەکاتەوە پێڕەو و بیرکردنەوەکانی غەیری خۆی بەڕێوە دەبات.

❊❊❊❊❊

**(دار لنکۆ) دۆزەرەوەی بەریتانیایی**

- دوای ژن بکەویت لێت هەڵدێ، لێی هەڵبێیت دوات دەکەوێت.

❊❊❊❊❊

**(دیل کارینگی) نووسەری ئەمەریکایی**

- ماستاوچێتی هەم قسەکەر، هەمیش گوێگر لەناو دەبات.

❊❊❊❊❊

- شێت بۆیە شێتە، چونکە ئەقڵی نییە تا بیربکاتەوە، لە شێت، شێتتر ئەوەیە کە ئەقڵی هەیە و بیرناکاتەوە!..

❊❊❊❊❊

- قسەکردن وەك گەشتکردن وایـە، دەبـێت بگاتە شوێنی مەبەست، بەهەمان بەڵگە دەبێ مرۆڤ پێش ئەوەی گەشت بکات مەبەست و نەخشەی هەبێت.

❊❊❊❊❊

- بە بیرم نایەت کوێرێك خۆی بە مندا کێشابێت، بەڵام هەر کاتێك شانم بەر کەسێك کەوتبێت پێیان وتووم چییە دەڵێی کوێریت!.

*****

- بهێڵن هەرکەسێك بە باوەڕ و بیر و ئارەزوو خوێندنەوە و زانیاریی خۆیەوە بڕیار بدات، نەك ئەوەی کە کەسێکی تووتی ئاسا بێت و وتەی کەسانی دیکە دووبارە بکاتەوە.

*****

- نیعمەتەکان بژمێرە نەك هیلاکی و ناخۆشییەکان.

*****

- سەرزەنشتی کەس مەکە با سەرزەنشت نەکرێیت.

*****

- بەرلەوەی رەخنە لە کەسی بەرانبەر بگریت باس لە هەڵەکانی خۆت بکە.

*****

- هەستم بە دڵتەنگی کرد، لەبەرئەوەی پێڵاوم نەبوو تا ئەو کاتەی لەسەر شەقامەکە پیاوێکم بینی هەردوو قاچی پەڕیبوو.

*****

**(دیالا بشارە) نووسەر و ڕۆژنامەنووسی لوبنانی**

- تەنیا جیاوازیی نێوان لەشفرۆشەکان و سیاسییەکان ئەوەیە" لەشفرۆشەکان بازرگانی بە لەشی خۆیانەوە دەکەن و سیاسییەکان بە لەشی ئەوانی دیکەوە بازرگانی دەکەن!..

*****

**(دانتی) شاعیری کلاسیکی ئیتاڵیایی**

- ئەوەی تەنها بۆ خۆی دەژی، مافی ئەوەی نییە بژی.

*****

- ئافرەت و خەیاڵ وەك یەکن، هەردووکیان بێ واتان.

**(دالای لاما) رێبەری رۆحی بودایییەکان**

- ئەگەر کەسێك جارێك ناپاکی لێ کردی ئەو هەڵەی کردووە، بەڵام ئەگەر بوو بەدوو جار ئەوە هەڵەی تۆیە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- لە ساڵدا تەنیا دوو ڕۆژ هەن، کە هیچ کارێکیان تێدا ئەنجام نادرێت، یەکیان دوێنێیە و ئەوی دیکە سبەینێیە، ئەمڕۆ باشترین ڕۆژە بۆ خۆشویستن، بۆ باوەڕ بۆ ژیانکردن!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- کەی هەستت بە پیربوونی خۆت کرد؟، (دالای لاما) هەر بەمنداڵی!. چۆن بەمنداڵی؟، (دالای لاما، لەبەرئەوەی من منداڵ بووم کە دایکم مرد.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

## پیتی (ڕ)

### (ڕالف واردۆ ئیمرسۆن) فەیلەسووف و شاعیری ئەمەریکایی

- بۆ ئەقڵە بچووکەکان خەمەکان گەورەن، بەڵام بۆ ئەقڵە مەزنەکان نەك هەر خەمەکانیان بۆ بچووکن، بگرە کاتیانیش نییە بۆ خەم هەڵگرتن.

*****

- ئەگەر متمانە بەخۆ بوونت لە دەست دا، کەواتە تەواوی گەردوون دژت وەستاوەتەوە.

*****

- بژی، بهێڵە کەسانی دیکە بژین، یارمەتی ئەوانەش بدە، کە ناتوانن بژین.

*****

### (ڕۆزڤێلت) سەرۆکی پێشووی ئەمەریکا

- لەگەڵ خۆتا مێشك بەکار بهێنە، لەگەڵ مرۆڤەکانی دیکەیش دڵت.

*****

- ئەوەی هەمیشە لای من ئاڵۆز بووە ئەوەیە، مرۆڤ نابێتە دیلی چارەنووسی خۆی، بەڵام زۆر بە ئاسانی دەبێتە دیلی خولیا و ئارەزو و هۆشی خۆی.

*****

**(ڕەنج سەنگاوی) شاعیر و میدیاکاری کورد**

- منالّیم بە دیار شەڕی دایکم و باوکم و گەورە بوونم بە دیار شەڕی حزبەکانەوە بەڕێکرد

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(ڕۆی ڕۆجەرز) هونەرمەند و دەرهێنەری ئەمەریکایی**

- ئەو خەڵکەش سەیرن مرۆڤ بەخەم و خەفەتەوە دەکوژن، دوایی چەپکە گوڵ لەسەر گۆڕەکەی دادەنێن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(ڕۆبرت شولر) نووسەری ناوداری ئەمەریکایی**

- دەتوانی تەنها ئەو کارە ئەنجام بدەیت، کە باوەڕت وایە دەتوانی ئەنجامی بدەیت، دەتوانی تەنها ئەوە بیت، کە باوەڕت وایە دەتوانی ببیت، دەتوانی تەنها ئەوە بەدەست بهێنیت، کە باوەڕت وایە دەتوانی بە دەستی بهێنی هەموو ئەمانە وەستاوە لەسەر ئەوەی، کە باوەڕت پێیەتی بەردەوام لە بیرت بێت تۆ تەنها یەك ژیان و یەك تەمەنت هەیە لە ژیاندا بەو پەڕی نایابییەوە بژی.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(ڕەسول حەمزەتۆف) شاعیری داغستانیی**

- مرۆڤ دوو ساڵی پێ دەچێت تا فێر دەبێ قسان بکات، شەست ساڵیشی پێ دەچێت تا فێر دەبێ دەمی خۆی بگرێت و قسان نەکات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- نیوەی جیهان لەو کەسانە پێکهاتوون، کە دنیایەك شتیان هەیە بۆ وتن، بەڵام ناتوانن بیڵێن، نیوەکەی دیکەی لەوانە پێکهاتوون، کە هیچیان نییە بۆ وتن، بەڵام هەمیشە قسان دەکەن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(ڕۆبێرت جۆردان) نووسەری چیرۆکی خەیاڵاوی، ئەمەریکایی**

- لە جەنگەکاندا، گەمژەکان، گەمژەکان دەکوژن لەبەر چەند هۆیەکی گەمژانە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(ڕۆمەن پۆلانسکی) دەرهێنەری سینەمایی و ئەکتەری پۆڵێندیی**

- ئاشقی جۆری بیرکردنەوەی مرۆڤەکان مەبە، مرۆڤەکان بیرکردنەوەیان جوانە، جوان قسە دەکەن، بەڵام جوان ناژین!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(ڕای کۆفۆرس) یاریزانی سربیایی**

- دوو جۆر مرۆڤ هەن، کە پێت دەڵێن تۆ ناتوانی جیاوازی لە ژیان دروست بکەی، ئەوانەی کە لە هەوڵدانت دەترسن و ئەوانەش، کە لە سەرکەوتنی تۆ دەترسن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(ڕەشید عساف) دەرهێنەری سینەمایی سوریا**

- تکایە دەست هەڵگرن لە خەڵك کوشتن بەناوی خوداوە، ئاخر خودا چۆن مرۆڤێك دەخوڵقێنێت هەتا تۆ بۆی بکوژی؟.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

## پیتی (ز)

**(زەردەشت) پەیامبەری ئاینی زەردەشتی**

- کاتێك زانیم خودا دەمبینێ، شەرمم کرد.

*****

- لێگەرێ با دنیا کۆتایی بێت، کەسە خراپەکان شایەنی ئەم ژیانە نین، کەسە باشەکانیش شایەنی ئەم دۆزەخە نین.

*****

- بە منداڵ و شێتەکان بڵێن، ڕێزی خۆتان بزانن، کە هیچ دنیایەك، جوانتر لە دنیای ئێوە نییە!..

*****

## پیتی (ژ)

**(ژان پۆل سارتەر) فەیلەسووف و چیرۆکنووسی شانۆیی فەرەنسایی**

- ژیان هیچ واتایەکی ئەزەلیی نییە، دەکەوێتە سەر خۆت چ واتایەکی پێ دەبەخشی، بەهاش هیچ نییە، جگە لەو واتایەی کە هەڵی دەبژێریت.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

- سیاسەت چەند هیچە!. تۆ دەبێت لە دەسەڵاتیان بترسیت، ئەوکات دەبیتە هاووڵاتییەکی ڕاستگۆ لایان.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

- ئاینی خۆمم دۆزیوەتەوە، لای من هیچ شتێك هێندەی کتێب گرینگ نییە، پەرستگەی من پەرتووکخانەیە.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

- سەگ سروشتێکی جوان و باشی هەیە هەرگیز بەو کەسە ناوەڕێت، کە تێری دەکات، ڕێك بەپێچەوانەی مرۆڤە.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

- هەرگیز شەرم مەکە لە تەنها مانەوەت، هەرگیز ڕێگە مەدە ببیتە قوربانی بۆچوونی کەسانی دیکە، هەرگیز پێناسەی ژیانی خۆت لە کەسێکی دیکە وەرمەگرە، خۆت پێناسەی بوونی خۆت بکە.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

- وەختێك سەرمایەدارەکان دەکەونە جەنگەوە، ئەوە هەژارەکانن دەمرن.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

- ئەگەر دوو فەیلەسووف گەیشتنە لای یەك، باشترین شت ئەوەی تەنها سڵاو لەیەك بکەن.

*****

- کاتێك کە تەنهاین بەدوای هاوڕێدا دەگەڕێین، کە بینیمانەوە بەدوای کەموکوڕییەکانیدا دەگەڕێین، کاتێکیش لە دەستی دەدەین لە تەنهایدا بە دوای یادگارییەکانیدا دەگەڕێین، با ئاگەداری دڵەکان بین هیچ شتێك زووتر لە دڵ ناشکێت.

*****

- ئەگەر هەستت بەتەنیایی کرد ئەو کاتەی بەتەنیایت، ئەوا لەناو کۆمەڵێکی باشدا نیت.

*****

- هەموو شتێك دۆزراوەتەوە، جگە لە چۆن ژیانکردن نەبێت.

*****

- دنیا نا دادپەروەرییە ئەگەر قبووڵی بکەی دەبیتە هاوبەش لە تاوان، ئەگەر بیگۆڕی دەبیتە جەلاد!..

*****

- خۆمان نازانین چیمان دەوێت و هێشتەش بەرپرسیارین بەرانبەر ئەوەی کە ئێمە چین.

*****

**(ژان ژاك رۆسۆ) چاکەخواز و فەیلەسووفی فەرەنسایی**

- ئەو مرۆڤانەی زۆر بڵێن کەم دەزانن، بەڵام ئەوانەی زۆر دەزانن هەمیشە کەمدوون.

*****

- مەزنترین جیاوازی نێوان مرۆڤ و چوارپێ هزر و ئەندێشە نییە، بەڵکو ویست و هەڵبژاردنە.

✻✻✻✻✻

- سینەیەك، کە ڤاڵا بێت لە زیکر و یادی خودای مەزن، وەکو دادگەیەکی بێ دادوەر وایە.

✻✻✻✻✻

- تاریکی نەزان چاکترە، لە ڕووناکی درۆزن.

✻✻✻✻✻

**(ژاك پرێڤێر) شاعیر و نووسەری فەرەنسایی**

- دنیا پڕە لە چاڵە خوێنی گەورە، ئەم هەموو خوێنە ڕژاوە بەرەو کوێ دەڕوات؟!. تۆ بڵێی زەمین بێت هەڵی لووشێت و خۆی پێ مەست بکات؟!.

✻✻✻✻✻

**(خۆزێ ساراماگۆ) چیرۆکنووس و دانەری شانۆی پرتوگالی**

- ئەگەر نەتوانم وەك مرۆڤ بژیم، لانی کەم هەوڵ دەدەم، کە وەك ئاژەڵ ژیان نەبەمە سەر.

✻✻✻✻✻

**(ژاك دریدا) فەیلەسووفی فەرەنسایی**

- من کەسێکی نیشتمانپەروەر نیم، بەڵام ئەو ڕاستییەش دەزانم ناپاکیکردن لەنیشتمان ئاخرین پلەی بێ ئەخلاقییە.

✻✻✻✻✻

## پیتی (س)

### (سادق هیدایەت) نووسەرو چیرۆکنووسی ئێران

- ئەگەر مرۆڤ دەست لە کوشتنی ئاژەڵ هەڵگرێ، ئەوا دەست لە کوشتنی مرۆڤیش هەڵدەگرێ.

*****

- کەسێك کە هیوابڕاو بوو پێی دەڵێن: برۆ سەرت بنێرەوە و بتۆپە!. بەڵام کاتێك مەرگیش مرۆڤی ناوێ، کاتێك، کە مەرگیش پشت لە مرۆڤ دەکات، مەرگێك، کە نایە و نایەوێ بێ، هەموو لە مەرگ دەترسن و من لە ژیانی لاساری خۆم!...

*****

- ئافرەت پیاوی ئاقڵی ناوێت، ئەوان هەمیشە کەیفیان بە هاوشانی خۆیانە!...

*****

- دەمەوێت چاوەکانم بۆ داهاتوو دابخەم، ڕابردووش لە بیر بکەم.

*****

- من لە قەحپە و لەشفرۆشەکان بێزار نیم، بەڵکو لە ناپاك و وڵاتفرۆشان بێزارم!...

*****

- مرۆڤ نەك تەنها دەبەنگترین ئاژەڵە، بەڵکو دڕەندەترین و شەڕانگێزترینیشیانە.

*****

- مەرگ بەختەوەری و نیعمەتێکە، بە ئاسانی نایدەن بە کەس.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ژیان زیندانێکە، ئەوپەڕی بتوانین، هەندێك نەخش و نیگار لەسەر دیوارەکانی هەڵبکۆڵین، مرۆڤ بەردەوام خۆی فریو دەدات، وەلێ ڕۆژێك دێت لە خۆ فریودانیش بێزار دەبین.
- قەسابخانەکان داهێنەری ئاژەڵی دوو پێن، هیچ جانەوەرێکی دڕندە و خوێن خۆر بەم شێوە ڕەزیلییە خۆراکی خۆی ناخوات، مرۆڤ ڕووی گورگ و گیانلەبەرە خوێن خۆرەکانی دیکەی سەر گۆی زەوی سپی کردۆتەوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

## (سوکرات) فەیلەسووفی گەورەی یۆنانیی

- سێ شت لە ژیانمدا زۆر ماندوویان کردم (ڕێزمان، هەژاری، ئافرەت)!. ڕێزمان بەزۆر خوێندنەوە زاڵ بووم بەسەریدا، هەژاریش پەلەم نەکرد و تا بەسەریدا زاڵ بووم، بەڵام ئافرەت تا ئەمڕۆ هیچ چارەیەکم بۆ نەکراوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- خۆر دەتوانێت هەموو ئاوی ئۆقیانووسەکان وشك بکات، بەڵام ناتوانێت فرمێسکەکانی ژن وشك بکات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- بۆ ئەوەی لە بیر نەکرێیت لای کەسێك، پێویستە شتێکی لە بیر نەکراوی بۆ بکەیت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- من دووجار مردم جارێك، کە ژنم هێنا، جارێکی دیکەش کە ئاشقی ژنەکەم بووم.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- لە دوژمنایەتیی پیاو مەترسە، بەڵام وریابە لە خۆشەویستی ئافرەت!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ژیری وا لە ناشیرینی دەکات جوان بێت، لە کاتێکدا جوانی ناتوانێ نەزانی چارەسەر بکات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ئەگەر کەسێك بڕواتە نێو گۆڕستانێك پرسیار لە مردووی نێو گۆڕەکان بکات، کە ئایا ئارەزووی دووبارە گەڕانەوە و ژیانەوە دەکەن، ئەوا هەموویان بەبێ جیاوازی سەریان وەك و نیشانەی نەرێ تەکان دەدەن و نەخێرێك دەڵێن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ئەگەربێ دەنگ بیت و خەڵکانی دیکە بەقسەت بهێنن زۆر باشترە لەوەی لە کاتی قسەکردندا بێ دەنگت بکەن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ئەو گەنجانەی کە پەلەی ژن هێنانیانە وەك ئەو ماسیانەن، کە بە بەر تۆڕی ماسیگردا هاتوچۆ دەکەن، ئەمیان هەر خەریکی هاتوچۆیە، بەڵام ئەو ماسییەی، کە بە تۆڕەکەوەیە پەلەقاژەی ڕزگار بوون دەکات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ئەگەر بەرپرسیارەتیت خرایە ئەستۆ، کەسانی خراپ لە خۆت دوور بخەرەوە، چونکە هەموو خراپییەکانی ئەوان دەکەوێتە ئەستۆی تۆ.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ئەقڵە فرەوانەکان گفتوگۆی بۆچوونەکان دەکەن، مامناوەندەکان گفتوگۆ لە هەمبەر ڕووداوەکان دەکەن، ئەقڵە لاوازەکان قسە لەسەر خەڵکی دەکەن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(سەعید نورسی) زانای ئاینی کورد**

- جگە لە خودا کەس لە خۆت بە مەزنتر مەزانە، نەوەك بیگەیەنیتە پلەی(پەرستن) خۆیشت لە هیچ شتێك بە گەورەتر دامەنێ، با دەرگەی خۆ بە گەورە زانینت لێ نەکاتەوە.
- خودا ئەگەر پێویستی بەوە بووایە ئێوە لەسەر زەوی بەکارەکانی ڕاپەرن، ئەوە لەدنیای دیکە، بەهەشتی بۆ چاکەکاران و دۆزەخیشیی بۆ خراپەکاران دانەدەنا.

❊❊❊❊❊

- ئەی نەفسی سەرکەشی یاخی بووم، چاك بزانە، کە تۆ ئەو ڕێبوارەیت ئەم بیابانە پڕ لە مەترسییەش ئەم دنیایە.

❊❊❊❊❊

**(سۆفۆکلیس) نووسەری شانۆیی یۆنانی**

- سەرکەوتن لەسەر هەوڵدان وەستاوە.

❊❊❊❊❊

- ئەی (خۆشەویستی) هیچ کەس ناتوانێت بەرەنگارت بێتەوە، تۆ ب سەر هەموو شتێکیدا سەردەکەوی.

❊❊❊❊❊

**(سوهراب سپیهری) شاعیر و نیگارکێشیی ئێران**

- مرۆڤ بۆ ئەوەی نەتوانێت خوێن بڕێژێت، دەبێت فێر بێت ئاو لێڵ نەکات، دەبێت فێر بێت گیا هەڵنەکەنێت..

❊❊❊❊❊

- دایك نیشتمان نییە، نیشتمان زۆر لەوە بچووکترە تا ببێتە دایك.

❊❊❊❊❊

- من گومانم لە سەرژمێری زەوی هەیە، ئەگەر ئەم زەوییە پڕە لە مرۆڤ بۆچی دەبێت ئەم هەمووە بە تەنیا بن؟!..

*****

**(سینۆهە) پزیشکی تایبەتی فیرعەون**

- ئەگەر مرۆڤێك نووقمی خەمەکان بکەیت، ئەوا لە کردارەکانی ڕابردووی پەشیمان دەبێتەوە، بەڵام ئەو کاتەی خەمەکانی لە ناوچوون دووبارە دەگەڕێتەوە بارودۆخی جارانی و هەروەکو جاران خۆپەرست و بێ بەزەیی دەبێت.

*****

- ئەگەر مرۆڤ دانایی خۆی بە کەسانی دیکە نەڵێت، ئەوا دڵی لەناو دەچێت.

*****

- ئاو نەرم و ڕەوانە، بەڵام بەرد دەتاشێت و سافی دەکات.

*****

- چەقەڵ لەوانەیە بۆ ڕاوکردنی ئاژەڵانی دیکە، لەگەڵ شێردا یەك بگرێت.

*****

- زانست کۆتایی نییە، مرۆڤ هەرچەندە شت فێر بێت، هێشتە داماوە و پێویستی بە فێربوونی زیاترە.

*****

- ئەستەمە ڕۆژێك بێت لە خۆبایی و خۆپەسەندی و خۆویستی لە ناوبچێت.

*****

- کاتێك مرۆڤێك نووقمی ڕووبارێك دەکەیت هەر کە جلەکانی بەری وشك بۆوە دەگەڕێتەوە سەر هەمان ئەو مرۆڤەی کە پێشتر بووە.

*****

- کاتێك دەبینین ژنێك یان پیاوێك لەخۆباییی دەبێت و بە چاوی سووك سەیرمان دەکات، دەبێ ئەوە بزانین، کە نەزان و دەبەنگە، لەبەرئەوەی هیچ شتێك نازانێت و فێرە ئەزموونێك نەبووە خۆی لە خەڵکی بە گەورەتر دەزانێت.

*****

- ڕاستی وەکو تیرێکی تیژ و برینێکی سارێژنەکراو وایە.

*****

**(ستالین) سەرۆکی پێشووی یەکەتیی سۆڤیەتی جاران**

- من ئەو سەربازانەم خۆشناوێت، کە ساغ و سەلامەت دەگەڕێنەوە، چونکە دڵنیام تاکۆتاییی جەنگ خۆیان شاردۆتەوە، ئەو سەربازانەشم خۆشناوێت بەس پێڵاوەکانیان دڕاوە، چونکە دەزانم بەس ڕایان کردووە، هەوڵ بدەن یان بە مردوویی بگەڕێنەوە یان لە حاڵی مردندا یان هەر نەگەڕێنەوە.

*****

**(ستیف جوبز) دامەزرێنەری کۆمپانیای (ئەپڵ)ی ئەلیکترۆنی ئەمەریکایی**

- من هەر کارێك ئەنجام بدەم، لە جێبەجێکردنی بیردەکەمەوە و ڕادەمێنم ئاخۆ ئەو کارەم، تا چەند قازانج و سوودی بۆ مرۆڤایەتی دەبێت، کە دڵنیا بووم سوودەکەی زیاترە لە قازانجە مادییەکەی ئەوسا دەکەومە خۆ کۆکردنەوە بۆ ئەنجامدانی، من مرۆڤم، بۆ سوود گەیاندن بە مرۆڤایەتیش تێدەکۆشم سامان لای من تەنها شتێکە نەك هەموو شت.

*****

- ئێمە بۆ ئەوە هاتووینەتە دنیاوە، بۆ ئەوەی شوێن پەنجەمان دیار بێت، ئەگەر نا سوودی هاتنەکەمان چی بوو.

*****

- تەمەنی تۆ لە ژیاندا دیارکراوە، لەبەرئەوە بە فیڕۆی مەدە بۆ کەسێك کە تا ئەو ڕۆژەی دەمریت لێت تێناگات و خۆشتی ناوێت.
- هەمیشە بڕواتان بە خۆتان هەبێت و بزانن مادەم مردن هەیە، ئیدی پێویست ناکات خەفەت بخۆین!. ڕێگە مەدە بە هیچ کەسێك لە خۆت قسەی زاڵتر بێت لە ژیانتدا!. ئەو بەشەی ژیان کە هەتە، بە بێ وەستان بەکاری بهێنە، من (٣٠) ساڵە هەموو ڕۆژێك وا دەزانم، کە ئەو ڕۆژە کۆتا ڕۆژی ژیانمە.

*****

- هەرگیز ئەوە مەڵێ ئەگەر لێم زیادبوو دەیبەخشم، چونکە سروشتی مرۆڤ بەجۆرێکە هەتا هەیبێت هەرپێی کەمە و هەرگیز وا هەست ناکات لێی زیادە، ئەگەر چاوەڕێی ئەوە بکەیت، کە لێت زیادبێت ئەوە تۆ هەرگیز نابیتە بەخشندە.

*****

### (ستیڤن هۆکینگ) زانای فیزیکی بەریتانیایی

- مەزنترین دوژمنی فێربوون نەزانین نییە، بەڵکو ترس لە زانینە.

*****

### (سانتایانا) فەیلەسووف و شاعیری ئیسپانیایی

- لە هەر کاتێکدا بە وتاری سیاسییەکان وروژایت و چەپڵەت بۆ قسەکانیان لێدا، ئەوە دەست لە هەبوونی ئەقڵت بشۆ و تۆسقاڵێك گومانت لە گەمژەیی خۆت نەبێت.

*****

### (سۆفسکی) فەیلەسووفی یۆنانیی

- زۆرینەی شۆڕشەکان دوو ئامانجیان هەیە: یەکەمیان، تێکشکاندنی فۆڕمە کۆنباوەکەی کۆمەڵگەیە، ئەوەی دیکەیشیان بریتییە لە دروستکردنی کۆمەڵگە بەو فۆڕمەی کە شۆڕشگێڕان بیری لێدەکەنەوە.

*****

**(سالنجەر) ڕۆماننووسی ئەمەریکایی**

- کچ بەزۆری بێمێشکن، کە تۆزێك دەستلەملانێیان دەبێ ئیتر چاك دەیان بینی ئەقڵیان لە سەر دانیی !.

**(سەلاحەدین دەمیرتاش) هاوسەرۆکی پارتی ئاشتی و دیموکراسی**

- ئێمەی کورد بێکەسترین نەتەوەین، کە بە تەنیا ڕووبەڕووی داگیرکاری هەموو دنیا بووینەتەوە!..

*****

**(سامویل بێکیت) ڕۆماننووس و دەرهێنەری شانۆی ئێرلەندیی**

- تاقە گوناهێك کە هەمانە، گوناهی لەدایك بوونمانە.

*****

**(سەعدی شیرازی) شاعیری ناوداری ئێران**

- بیرکردنەوە لەوەی کەچی بڵێیت، زۆر لەوە باشترە، کە بیر لەوە بکەیتەوە بۆچی وام وت!..

*****

**(سولێمان حەکیم) پەیامبەری جوولەکان**

- ئەوەی گوێ لە هاواری لێقەوماوان کەڕ دەکات، هاواری ئەوەیش نابیسترێ.

*****

**(سیمۆن دی بووار) فەیلەسووف و ڕۆماننووسی فەرەنسایی**

- تەڵاق، فیشەکی کۆتاییە، لە شەڕی نێوان ژن و مێرد دا!...

*****

### (سەن ئۆلەر) خزمەتکارەکەی ناپلیۆن

- ژنان لە سەردەمی حەزرەتی حەواوە تا ئەمڕۆ نەگۆڕاون، ئەگەر شاژنیش بن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

## پیتی(ش)

### (شۆپنهاوەر) فەیلەسووفە رەشبینەکەی ئەڵمانیا

- دەرخستنی ڕاستی ویژدانی ئارام و ڕۆحی ئازاد و ئیرادەی بەهێزی دەوێ.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- دەشێ سروشت ژنی پڕ چەك کردبێت بە مەکرو درۆ و هەڵخەڵەتاندن، چونکە بێ بەشی کردووە لە بەخشندەیی و بلیمەتی.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- کەسێك کە کارێکی هەڵە بکات و بەخۆی پێبکەنێ، بە دڵنیایەوە هەرگیز ناڕوخێ ئەگەر هەموو جیهان پێی پێبکەنن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ئەوانەی تاکە ئامانجیان تەنها کۆکردنەوەی پارەیە، لە کۆتایی تەمەنیاندا لەوە تێدەگەن کە تاکە شتێك ناتوانێت لە مردن بیان پارێزێت پارەیە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- بە ئازارترین جۆری خۆکوشتن لە پیاواندا چوونە ناو ژیانی هاوسەرییە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ئەو کەسەی بۆ گەمژەکان دەنووسێت، هەمیشە دڵنیایە لە بوونی خوێنەرێکی زۆر.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- هاوسەرگیری، ڕێککەوتنی دڵەکانە، نەك ئەقڵەکان.

*****

- خۆ بەدەستەوە نەدان بۆ کارەساتی چارناچاری گرینگترین توێشووی سەفەری ژیانە.

- دەکرێت بە گومانەوە بڵێین ئافرەتیش جۆرە بوونەوەرێکە، بەڵام من وەك خۆم ناتوانم ئافرەت لە چینی مرۆڤ دابنێم چونکە ناکرێت و نەگونجاوە ئافرەت مرۆڤ بێت!..

*****

- یەکەمین وانە، کە پێویستە باوك و دایك بە منداڵەکەیان بڵێن، ڕاستگۆییە.

*****

- ئەگەر زەوی خڕ نەبووایە لە تەواوی ئافرەتانی دنیا هەڵدەهاتم هەر ئامادە بوونیان کارەسات و کێشە و نەهامەتییە تاکە شتێك، کە ئافرەتان و ئێمەی مرۆڤی کۆکردۆتەوە زەوییە هەر بۆیە ئاسمانیشم لەبەر زەوی خۆشناوێت.

*****

- عەشق شۆڕش نییە، بەڵام گۆڕەپانێکە پڕیەتیی لە بریندار و شەهید.

*****

- پرسیار لە شۆپنهاوەر دەکرێت: بەڕێز شۆپنهاوەر تۆ زۆرترین قسەی ڕەقت بەرامبەر ژن کردووە ئایە پێناسەت بۆ ژن چییە؟ شۆپنهاوەر: تکایە با پرسیارەکانت لە بارەی مرۆڤەوە بێت!.

*****

- گەورەترین هەڵەی پزیشکەکان ئەوەیە، کە تەنانەت دەیانەوێت دڵێکی شکاویش بە حەب و دەرمان چاکەنەوە..

*****

- هەندێك ژن گوێچكەیان بە كەڵكی هیچ نایەت، تەنها بۆ هەڵگرتنی گوارە نەبێت!..

* * * * *

- دوو شت مەحاڵن، گرتنی كلكی ماسی و ڕاگرتنی دڵی ئافرەت.
- تاكە هۆكاری ئەوەی، كە ژنان، كەیفیان بە من نایەت، ئەوەیە، كە بەشان و باڵیان هەڵنادەم و مەكر و نازیان هەڵناگرم، (ئا بیرم چوو، كەمێك گیرفانیشم بەتاڵە!.

* * * * *

- ئەگەر ئافرەت بوونی نەبووایە، سوێند دەخۆم پیاو نەدەمرد.

* * * * *

- زەمكردن و قسەكردنی بێ پشودان خووگرتنێكە، كە ژنان لێی وەڕەز و بێزارنابن.

* * * * *

- تەواوی ژیانی مرۆڤ هیچ نییە، جگە لە تێكۆشانێكی سەرسەختانە بۆ مانەوە لە ژیاندا، سەرەڕای ئەوەی یەقینی ئەوەشی هەیە، كە لە كۆتاییدا دۆڕاویی بەشێتی.

* * * * *

- هەر جیا بوونەوەیەك، جۆرێكە لە مردن.

* * * * *

- هەر كەسێك بەردەوام وتی كاتم نییە، ئەوە كەسێكی بێ كارە !.

* * * * *

- كتێبە خراپەكان. ڕۆح و بیركردنەوە وێران دەكەن.

* * * * *

- خوێندنەوە تێگەیشتنە لە بیرکردنەوەی ئەوانی دیکە..

❊❊❊❊❊

- زمان بەنرخترین میراتی میللەتەکانە.

❊❊❊❊❊

- هەرگیز هیچ مرۆڤێك شادی و خۆشی نەدیووە، ئەگەر بیبینیبایە، ئێستە هەموومان شێت دەبووین.

❊❊❊❊❊

- ژنان دابەش دەبن بۆ: هەڵخەڵەتێنەر و هەڵخەڵەتێنراو، ناپاك و خیانەت لێکراو.

❊❊❊❊❊

- ڕادەی دڕندەگەری مرۆڤ هیچی کەمتر نییە لە دڕندەگەری پڵنگ.

❊❊❊❊❊

- ناوبانگ بەدەست دەهێنرێت، بەڵام شەرەف شتێکە دەبێ لەدەست نەدرێ.

❊❊❊❊❊

- ئەگەر پیاو بیتوانیبا منداڵی ببێت، هەموو ئافرەتی جیهان خۆم بەدەستی خۆم لە ناوم دەبردن.!...

❊❊❊❊❊

- پیاوان مرۆڤ گەلێکی یەکجار ناسکن، تاوانێکی گەورەیە ئافرەتان بیر لە ئازاردانیان بکەنەوە و پێویستە بە ئاوریشمەوە دەست بۆ دڵیان ببردرێت.

❊❊❊❊❊

- ڕۆژنامەنووسەکان وەکو سەگ وان، دەست دەکەن بە وەڕین بۆ هەر شتێك کە بجووڵێت!...

*****

- لێکۆڵینەوەم لەسەر هەموو بوون و نەبووەکان کرد تا بزانم سەرچاوەی (درۆ) چییە؟ نەمزانی سەرچاوەی درۆ چییە، بەڵام ئەوەم زانی، کە جگە لە مرۆڤ کەسی دیکە درۆ ناکات.

*****

- نەفرەتی خوا لە پیاوەتی ئەو پیاوە بێت، کە ژیانی خۆی دەبەستێتەوە بە وشەیەکی هەڵلەرزیو لەسەر دوو لێوی هەر ژنێك.
- گەشەکردنی شارستانییەت بە بێ کتێب نەشیاوە کتێب داینەمۆی گۆڕانە، پەنجەرەیەکە بە ڕووی جیهاندا، تاوەری ڕووناککەرەوەیە.

*****

- پێوەندیی نێوان پێنووس و ئەندێشە، وەکو پێوەندیی نێوان گۆچان و بەرێدا ڕۆیشتنە بێ گۆچان باشتر دەڕۆین و کاتێك پێنوسمان بە دەستەوە نییە باشتر بیر دەکەینەوە، مرۆڤ تەنیا کاتێك پەککەوتە دەبێت، کە دەست بۆ گۆچان و پێنووس دەبات.

*****

- بۆ ئەوەی لەنێو هەمووماندا بوونت هەبێ دەبێ گۆڕانکاریی قبووڵ بکەی، بۆ گۆڕانکاریی دەبێت گەشە بە بیرکردنەوەکانت بدەیت، بۆ گەشە پێدان بە ئەقڵ دەبێ لە ژیان بەردەوام بیت و هەرگیز لێی نەترسێیت.

*****

- جیاوازی نێوان لەخۆبایی و خۆپەرستی لەوەدایە، کە لەخۆبایی بە واتای ئەوەیە، کە بڕوایەکی بەهێزت هەبێت بە بەها بەرزەکانی خۆت لە بوارێکی تایبەتدا، بەڵام خۆپەرستی خواستی دروستکردنی ئەو بڕوایە لە لای کەسانی دیکە و زۆرینەی کاتیش هاوڕێیە هاوکاتە لەگەڵ ئەو ئارەزوو نهێنییەی، کە خۆشمان بەو

بڕوایە بگەین (بڕوا بکەین) بۆیە لەخۆبایی لە ناخی مرۆڤەوە هەڵدەقوڵێت (سەرچاوەی غرور دەروونی مرۆڤ) و بەرئەنجامی ڕێزگرتن و دەستخۆشی کردنە لە خودی خۆمان، بەڵام خۆپەرستی هەوڵدانێکە بۆ بەدەستهێنانی ڕێزلێنان لە دەرەوە واتا، بەدەستهێنانی ڕێز و دەستخۆشی کردن بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، بۆیە لەو ڕوانگەوە، خۆپەرستی دەبێتە هۆی زۆر بلێی مرۆڤ، (زۆر قسە بکات) بەڵام غرور دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ کەمتر قسە بکات.

*****

- هەموو منداڵێکی بێ ئەقڵ دەتوانێت مێرووولەیەك بکوژێت، بەڵام هەموو زاناکانی دنیا ناتوانن مێرووولەیەك خەڵق بکەن.

*****

- باشتر وایە لە جێگەی ئەوەی ژیان بەدیاری ئەژمار بکەین، با ناوی لێبنێین قەرزێکی نەفرەت لێکراو، چونکە بەزۆر بەسەرماندا سەپێنراوەو بە زۆریش لێمان وەردەگرنەوە.

*****

- خۆشەویستی گوڵە و ئافرەتیش دڕکیەتی.

*****

- مرۆڤی تەواو و کامڵ ئەو کەسەیە، کە خۆی( خۆی دروست بکات).

*****

- زۆرینەی خەڵك ئەگەر مێشکیان هێندەی قسەکانیان گەورە بووایە، ئیدی شتێکیان نەدەبوو بە ناوی کێشە و نەهامەتی.

*****

- خۆشەویستی هیچ نییە، جگە لە گەمەکردن بە چارەنووسی تاك.

*****

- مرۆڤە دڕندەکان یەکتر دەخۆن، مرۆڤە پێشکەوتووەکان یەکتر فریو دەدەن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- زۆرینەی جووت بوونەکان (هاوسەرگیری)، بەرهەمی هەڵبژاردن و داخوازی ڕاستەقینەی ئێمە نین، بەڵکو بەرهەمی ئەندێشەی ڕووکەشین و هەلومەرجی لە ناکاون.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- جووت بوون واتە یەکەتیی دڵ نەك زەین.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ئافرەتی جوان ئەندێشەیە و ئافرەتی نابووت ڕاستییە.
- بۆ ئەوەی لەنێو هەمووواندا بوونت هەبێ دەبێ گۆڕانکاریی قبووڵ بکەی، بۆ گۆڕانکاریی دەبێت گەشە بە بیرکردنەوەکانت بدەیت، بۆ گەشە پێدان بە ئەقڵ دەبێ لە ژیان بەردەوام بیت و هەرگیز لێی نەترسێیت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- خۆپارێز ترسنۆکە و ترسنۆکیش هەم ترسنۆکترە و هەمیش زیاتر تەمەن درێژە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ئەو پیاوانەی بەشان و باڵی ژندا دەڵێن و ماستاو و مەرایی بۆ ژن دەکەن، مەسەلەکە تەنها سێکسە هیچی دی.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ژیان خراپەیە واتە شتێکە نەدەبووایە بوونی هەبووایە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

- ژن بوونەوەرێکی ناتەواوە و شایانی هیچ پەروەردە و فێرکردنێك نییە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● جیهان بە هیمەتی گەنجان و ئەزموونی پیرانەوە بەڕێوە دەچێت.

* * * * *

● کەسایەتی مرۆڤ لە نەتەوە زۆر گرینگترە و پێویستە هەزاران جار زیاتر لە (نەتەوە) گرینگی پیّ بدرێت.

* * * * *

● جگە لە مرۆڤ هیچ بوونەوەرێك لە بوناپاتییەکەی خۆی سەری سووڕنامێنێت لەم سەرسووڕمانەوەیە، کە پێویستی بە میتافیزیك دێتە ئاراوە، کە تەنیا تایبەتە بە مرۆڤ، مرۆڤ ئاژەڵێکی میتافیزیکە.

* * * * *

● کۆتا چیرۆکی نهێنی ژیان، هەر لەم ئازارەداییە، کە بەسەر ڕۆژە ڕەشەکاندا هەڵدێت.

● ئاژەڵەکان لە هەر جێگەیەك دا بن پیڕەوی یەك بنچینەی ناوەکی دەکەن، ئەویش پاراستنی بوونە.

* * * * *

● لەو کاتەوەی کە لە مێژووی بوونەوە پیّ دەخەینە سەر دنیای بوون، خۆمان لە دنیایەکدا دەبینینەوە، کە تەواوی دانیشتووانی لەنێو زنجیرەیەك لە ڕەنج و ئازاردا گرفتارن.

* * * * *

● خۆشترین ساتەکانی ژیان تەنانەت ژیانی بەختەوەرەکانیش تەنها کاتێکە، کە دەچنە نێو خەوەوە، ناخۆشترین ساتیش ئەوە دەمەیە کە بێدار دەبنەوە.

* * * * *

● بە دەگمەن بیر لەو شتانە دەکەینەوە، کە هەمانە بەڵکو هەمیشە لە بیری ئەم شتانە داین کە پێوستمانە.

*****

● خواست ئەژدیهایەکە، کە هەرگیز تێر نابێت، هەر خواستێك خواستێکی دی دەخوات، هەمیشە لە پاش ڕازیکردنی خواستێك یان پڕکردنەوەی پێویستییەك خواستێکی دی جێگەی دەگرێتەوە و ئێمە ناتوانین لە دەست ئازار دەرباز بین.

*****

● هەژارەکان بە زۆرترین ڕادە بەشدارن لە ڕەنج و بێبەشی و نائومێدی، کە بەرهەمی هەژارن و دەوڵەمەندەکانیش تێك ئالاوی دەرد و خەمی ئاسانترین ڕێگەی گەیشتن بە خواستەکانیان.

*****

● ژیان بەدبەختییە، چونکە مرۆڤ بە شێوەیەکی بەردەوام لە بەردەم مەترسی ڕووداوەکان و نەخۆشی و مەرگ دایە.

*****

● خەڵك وەك یاری دەڕواننە ئەشق، ئەمەش لە حاڵێك دایە کە ئەشق یاری نییە ئەم ئاشق و ماشوقە، کە دەستی سرووشت یارییان پێ دەکات.

*****

● لە بلیمەتەکاندا هێزی ئەقڵی پترە لە هێزی حەز و ئارەزوو، بەڵام بە پێچەوانەوە لە کەسە ئاساییەکاندا هێزی حەز و ئارەزوو زاڵترە بەسەر هێزی ئەقڵدا.

*****

● لە سەرسووڕهێنەرییەکانی دنیای سرووشت ئەوەیە، کە تەنها مرۆڤ واتە گوڵی سەرتۆپی بوونەوەرەکانە تووشی شێتی دەبێت و سەرجەم گیاندارانی دیکە بەو واتاییەی، کە ئێمە لە شێتی دەگەین تووشی شێتی نابن.

*****

● ژنان لە تەواوی تەمەنیاندا وەك منداڵ دەمێننەوە، واتە هێزی بیر و مێشکیان لە پاش منداڵییەوە گەشە ناکات، لەم ڕووەشەوە بەشێوەیەکی ڕاست و تەندروست سەر و کاریان لەگەڵ هونەر و زانست دا نییە، ئەگەر خووش بدەنە فێربوونی هونەر و زانست تەنها و تەنها بۆ ڕاکێشانی سەرنجی رەگەزی بەرامبەرە.

*****

● مرۆڤ بیر لە ڕابردوو دەکاتەوە و لە ئایندەش دەترسێت.

*****

● خۆپەرست کەسێکە، کە هەموو خۆشی و بەرژەوەندییەکانی بە تەنیا بۆ خۆی دەخوازێت، تەنانەت ئەگەر کەسانێکیش بخاتە مەترسی و ناخۆشییەوە.

*****

● پرسیارم لێ دەکەن لەبارەی (مار)ی نەرم و نییان، کەچی هەمیشە لەبەر چاویانە، کە ئەویش ئافرەتە.

*****

● جیاوازی سەرەکیی لە نێوان لاوێتی و پیری دا ئەوەیە، کە مەبەست لە یەکەمیان ژیانە و دووەم مردن.

● سەرەتاییترین و گرینگترین هۆکارەکانی خۆشبەختی مرۆڤ بریتییە لە رەفتار و ئاکارەکانی خودی خۆی.

*****

● ئەگەر تەندروستی ناتەواو بێت چێژی ژیان وەك ئاوی سازگارە لە دەمێکی ژەهراوی دا.

*****

● ژیر بەدووی خۆشییەوە وێڵ نییە، بەڵکو خۆ لە ئازار و مەینەتی لادەدا.

*****

● هەر ئارەزوویەك فریوێکی نوێیە، کە هێشتە نەناسراوە هەر تێرکردن و دامرکاندنی حەزێك فریوێکە، کە پێی ئاشناین.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئێمە بەردەوام لە هەوڵ داین تا خۆمان لە ئازار قوتار بکەین، بەڵام سەرجەم هەوڵەکانمان لە خالێکدا کۆ دەبێتەوە ئەویش ئەوەیە، کە بەردەوام ئازارەکانی خۆمان دەگۆڕین.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● من هیچ سەرسووڕما و نابم، کە دەبینم هەندێ کەس لە کاتی تەنیاییدا هەست بە خەمباری دەکەن!. چونکە ئەوان ناتوانن بە تەنیایی پێ بکەنن، تەنانەت ناتوانن بیر بکەنەوە، تەنانەت پێکەنین لە کاتی تەنیاییدا بە رەفتارێکی شێتانە لە قەڵەم دەدەن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ژیان پرسیارێکی دژوارە، بەڵام من پێم باشە تەرخانی بکەم بۆ تێڕامان لەسەر خۆی !.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئەوانەی تاکە ئامانجیان تەنها کۆکردنەوەی پارەیە، لەکۆتایی تەمەنیاندا لەوە تێدەگەن، کە تاکە شتێك ناتوانێت لە مردن بیان پارێزێت پارەیە.

**(شکسپیر) شانۆنامەنووسی بەناوبانگی بەریتانیایی**

● خراپترین گوناه ئەوەیە، کەسێك راستگۆ بێت لەگەڵ تۆ و تۆ درۆزنبیت لەگەڵی.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● خۆشت بوێم یان ڕقت لێم بێت، هەردووك لە بەرژەوەندی مندان، ئەگەر خۆشت بوێم، ئەوا هەردەم لەناو دڵتام، ئەگەر ڕقیشت لێم بێت هەمیشە لە خەیاڵ و بیرتام.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● سەرم لە ژنان سوورِ ماوە، کە لەم خوا گەورەیە تەنیا مێردێکیان دەوێت و لەم مێردە بەدبەختەیش، هەموو دنیایان دەوێت.

❊❊❊❊❊

● هەرگیز گورگەکان نەدەبوون بە گورگ، ئەگەر مەڕەکان نەبونایە بە مەڕ.

❊❊❊❊❊

● ژیان چییە؟ خەونێکە بێ نووستن، مردن چییە؟ نووستنێکە بێ خەون.

❊❊❊❊❊

● هەرگیز هاوڕێ باشەکان لە دەست خۆتان مەدەن، هاوڕێ باشەکان وەکو قۆپچەیەکی پۆلاین بەکراسەکانتان قایم بکەن.

❊❊❊❊❊

● شێت و ئاشق و شاعیر هەرسێکیان هەمیشە لە خەیاڵدا دەژین.

❊❊❊❊❊

● ئاگەداری کەسایەتیی خۆت بە، چونکە لە تۆ زیاتر دەژێت.

❊❊❊❊❊

● کاتێك دەریا هێمنە، هەموو دەریاوانان، شارەزایی خۆیان نمایش دەکەن.

❊❊❊❊❊

● ئەگەر بەدرێژایی شەو بۆ لە دەستدانی هەتاو خەم بخۆی، ئەوا چێژی بینینیی ئەستێرەکان لە دەست دەدەی.

❊❊❊❊❊

● ئەگەر واز لە گرفتەکان بهێنیت، هەرگیز ڕێگە چارەیان بۆ نادۆزیتەوە.

❊❊❊❊❊

● بستێ زەوی بەسە، بۆ دوو کەس، کە یەکدییان خۆشبوێت، بەلاّم هەموو دنیا بەشی دوو کەس ناکات، کە ڕقیان لەیەك بێت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئەی بێ هێز، کە ناوت ئافرەتە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● لەو کاتەدا، کە تۆ زۆر بە قوولی هەست بە تەنیایی دەکەیت، دڵنیابە، کە کەسێك بۆ بینینت چرکەکان دەژمێرێت..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئەو کەسەی، کە بیەوێ مەشخەڵێکی بەهێز داگیرسێنێت، دەبێت بەکەمێك پووش دەست پێبکات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● کەسێك تەنها لەبەر جوانی هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێکدا دەکات، وەك ئەو کەسە وایە کە تەنها لەبەر خاتری وێنەی سەر بەرگەکەی، کتێبێك دەکرێ.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● فرمێسك ڕشتن نیشانەی خۆشەویستییە، بەڵام دەرمان نییە.

● ئەخلاق و ئەدەب و مرۆڤ بوون پێوەندییان بە پلە و پایە و ئاست و رۆشنبیریی مرۆڤەوە نییە، زۆرن ئەوانەی پلە و پایەیان بەرزە، بەڵام هێشتە زۆریان ماوە بن بە مرۆڤ.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(شێخ مەحمودی حەفید) مەلیکی کوردستان**

● گەر مانعی هەقی میللەتی کورد بن عارەب، بێ شك ئەڵێم نوێژەکانم بە کوردی قەزا ئەکەم.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(شاتۆ بریان) نووسەر و شاعیری فەرەنسایی**

● ئافرەت ئەگەر ڕێگەی پێ بدرێت، خەو و خۆراکیش لە خۆی دەبڕێت بۆ قسەکردن.

* * * * *

● ژیان بەبێ ئافرەت و لەگەڵ ئافرەت تەحەمول ناکرێت!.

* * * * *

● بەختەوەری وەك تۆپی یاری تۆپێن وایە، کاتێك، کە لێمان دوورە بەدوایدا ڕادەکەین کاتێکیش دەیگەینێ شەقێکی تێ هەڵدەدەین.

* * * * *

**(شێخ محەمەد غەزالی) زانای موسڵمانیی میسری**

● من لە مرۆڤێك ناترسم، کە بیردەکاتەوە ئەگەر گومڕاشبێت، لەبەرئەوەی بە بیرکردنەوە دەگەڕێتەوە بۆ ڕێگەی ڕاست، بەڵام لە مرۆڤێك دەترسم، کە بیر ناکاتەوە ئەگەرچی، کە خاوەنی هیدایەتیش بێت، چونکە وەك پەڕی چۆلەکە وایە بەدەم باوە بەکەمترین با لەرێ دەردەچێت.

* * * * *

**(شێخ شەعراوی) وەزیری پێشووتریی ئەوقافی میسر**

● گەر لە ژیانتا کەسێکت نەدۆزیەوە ڕقی لێت بێت، بزانە کەسێکی فاشیل بوویت.

* * * * *

**(شێرزاد حەسەن) ڕۆماننووسی کورد**

● درۆیەکی گەورەیە بڵێین ماڵی کوردی ماڵێکە بۆ خۆشەویستی، ماڵی کوردی زیندانی یەکەمە، قوتابخانە زیندانی دووەمە، کە چویتە ناو حزبەوە زیندانی سێیەمە.

* * * * *

● ئەگەر بەڵێنە زانکۆکانی ئێمە مێ و نێری خۆناس و دنیاناس و گومانکار و زانستخواز و دەم پڕ لە پرسیار و رەخنەگر و چاو نەترس و یاخی دروست بکەن، ئەی ئەو هەموو مەردوومە گوێ کەڕیلە و خامۆش و بێ زمان و چاوە لە کام کارگەوە بەرهەم هاتوون؟!.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئێمە نەوەیەکی بەربادبووین، کە شێتەکانمان بەردباران دەکرد تاوەکو بیسەلمێنین، کە خۆمان شێت نین، کچە پاکیزەکانمان ئەتك دەکرد بە ناوی خۆشەویستییەوە بۆ ئەوەی بیسەلمێنین، کە پیاوین !!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(شێرکۆ بێکەس) شاعیری گەورەی کورد**

● لەشفرۆشێك لەسەر شەقامێکی گشتیی کراسەکەی هەڵدایەوە و هاواری کرد" من هەر جەستەی خۆم ئەفرۆشم، هەرخۆم و بەس!. بەڵام لەسەر ئەم شەقامە ئەیانبینم تیایاندایە جەستەی شاخ، جەستەی دەشت و جەستەی باغچە و جەستەی هەتاو و بارانی فرۆشتووە و بێ دەربەستیش لەسەر کورسی شەرافەتی ئەم وڵاتەش دانیشتووە!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● مەرگ ئێستە مەرگم، هەموو شەوێ جارێ، دوو جار بە سەردان دێ و شان ئەداتە سەر شانی خەونەکانم، ئێستە مەرگم سێبەرێکە هەموو ڕۆژێ هەنگاوەکانم ئەژمێرێ و ئەمپشکنێ و ئەگەڕێ بۆ تازەترین ناونیشانم!..

● لەبەرچاومە دواین جار هەر من و تەنیایی پێکەوە دەمێنینەوە.. ئەو ئاگری جگەرەکەی دەکوژێنێتەوە و منیش بۆ هەتاهەتایە ئیتر ئەنووم !.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

## پیتی (ع)

### (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) چوارەم خەلیفەی ڕاشدین

● قسەی هەق هاوڕێی بۆ نەهێشتوومەتەوە!..

*****

● منداڵەکانتان بەو شێوەیە پەروەردە مەکەن، کە خۆتان دەتانەوێ، چونکە ئەوان بۆ سەردەمێکی دیکە لە دایك بوون.

*****

● کەسێك، کە بە چاوی پڕ لە ئومێد تەماشای تۆ دەکات، بێ ئومێدی مەکە.

*****

● ڕۆژەکانی ژیان وەکو هەور تێدەپەڕن، کەواتە کاری چاکە بکە هەتا زیندوویت.

*****

● هاوڕێیەتی پیاوی گێل مەکە، چونکە کردەوەکانی لات جوان دەکات و پێی خۆشە تۆش وەك ئەو بیت.

*****

● باشترین میرات ئەدەبە، خراپترین هەژاری نەزانینە، باشترین کۆمەڵ ڕاوێژکردنە هیچ سەرمایەیەك لە ئەقڵ چاکتر نییە.

*****

● کاتێك خەڵکە باشەکان لە بەرامبەر خراپە بێدەنگ دەبن، خەڵکە خراپەکان تووشی وەهمی ئەوە دەبن، کە ئەوان لەسەر هەقن.

*****

● شەرم مەکە بە پێدانی کەم، نەدانی زۆر لەوە کەمترە.

*****

● دنیا وەکو (مار) وایە دەست لێ دانی ئازارە و ڕووالەتی بریقەدارە، بەڵام لە ناخیدا هەڵگری ژەهرێکی ترسناکە ئەوەی، کە لێی نێزیك دەبێتەوە گەمژەیە و ناحاڵییە، ئەوەی لێی دووردەکەوێتەوە خاوەن ژیرییە.

*****

● لۆمە و سەرزەنشتی ژیر و دانایان زۆر کاریگەرترە لە سزای ستەمکاران.

*****

● مەزنترین نەنگی لووتبەرزی و لە خۆباییبوونە.

*****

● بەرزترین لووتکەی خوو رەوشت ئەوەیە، کە مرۆڤ شەرم لە نەفسی خۆی بکات.

*****

● سەرەدەمێکی زۆر ناخۆش دێت، کە تیایدا دەوڵەمەند زەکات لە ماڵەکەی نادات و دەبێت بە بەندەی داراییەکەی.

*****

● باشتر وایە گوێ لە دوژمنێکی ژیر بگریت، وەك لە هاورێیەکی گەوجت داوای ئامۆژگاری بکەیت.

*****

**(عەلی شەریعەتی) ڕووناکبیر و کۆمەڵناسی ئێران**

● لە جیاتی ئەوەی کە مرۆڤی بە توانا دروست بکەین، بیرمان نەچێت کە دەبێت مرۆڤی چاك دروست بکەین.

*****

● ئافرەت، هەرکات، جوانی هزر و بیرکردنەوەی دۆزیەوە و لێی تێگەیشت، ئەو کات جوانی جەستەی هەرگیز دەرناخات!.

● هیچ کاتێك مرۆڤ وەکو ئەمڕۆ بە توانا و زاڵ نەبووە بەسەر سروشت و وەکو ئەمڕۆ لە بەرامبەر نەفس و دەروونی خۆیدا و لە بەرامبەر خودی خۆیدا و ویست و ئارەزووە نزمەکانی، سست و نزم نەبووە.

*****

● من لە گۆڕستانی سەگەکان بنێژن، بۆ ئەوەی ساتێك لەگەڵ بەوەفاکان بژیم.

*****

● دایکم دەیگووت: ئەشق شەوێکە و پەشیمانی هەزار شەوە، بەڵام ئێستە هەزار شەوە پەشیمانم، بۆچی شەوێك ئاشق نەبووم!...

*****

● زۆر بەداخەوە، کە ڕۆژێك دێت، بێ دینی دەبێتە ڕەمزی ڕۆشنبیری!...

*****

● مرۆڤەکان نزم دەبنەوە، باڵەخانەکان بەرز دەبنەوە، ئای چ سەردەمێکی سەیرە!. کاتێك سەرمایە و پارە پێش چاوی مرۆڤ ڕەش دەکات ئیتر مرۆڤ بەرژەوەندپەرست دەبێت، لە جیاتی پارە خۆشەویستی بۆ هیچ شتێکی دیکە ناڕوات، لەگەڵ سەرمایەدا، هەستکردن کەم دەبێت و هەستی بۆ دڵێکی شکاو ناڕوات، هەستی بۆ گوڵێك ناڕوات، هەستی بۆ منداڵێکی برسی ناڕوات، هەستی بۆ (خوا و پێغەمبەر و نیشتمان ناڕوات)!. بەڵێ ئەوە سیفەتی مرۆڤی بەرژەوەندپەرستە.

*****

● توخوا ئەگەر مردم کتێبی ناو کتێبخانەکەم بفرۆشن و مارەی ژنەکەمی لێ بدەن، با نەڵێن ئەو پیاوە هەر قسەی دەکرد و کرداری نەبوو.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئەشق بچووککردنەوەی هەموو دنیایە بۆ یەك کەس و گەورەکردنی یەك کەسە بەقەد هەموو دنیا.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئەگەر گوناه کێشی هەبوایە، ئەوا هیچ کامێکمان نەماندەتوانی هەنگاو بنێین.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● قورئان من شەرمەزاری تۆم، ئەگەر لە تۆ ئاوازی مەرگم ساز کردووە، کە هەر کات لە کۆڵانەکەمان دا ئاوازت بەرزدەبێتەوە، گشتیی لەیەك دەپرسن کێ مردووە؟. چ غەفڵەتێکی گەورەیە، وا دەزانین خودا تۆی بۆ مردووەکانی ئێمە ناردووە!...

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئەوەی لە ناوەرۆکی حەج نەگەیشتبێت لە (مەککە) بە جانتایەکی پڕ لە دیاری و بە مێشکێکی ڤالاوە دەگەرێتەوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● دراوسێکەمان لە برسان مرد، خزم و کەسوکار و دەوروبەرەکەی مەڕ و ماڵاتیان سەربڕی بۆ پرسەکەی!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● پێم باشە بە پێڵاوەوە لەسەر شەقامەکاندا بڕۆم بیر لە خوا بکەمەوە، نەك لە مزگەوتدا دانیشم و بیر لە پێڵاوەکانم بکەمەوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ژیان چیرۆکی ئەو پیاوە بەفر فرۆشەیە، کە پرسیاریان لێکرد فرۆشتت؟ وتی نەیانکڕی تەواو بوو.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● لە ڕۆژگاری نەزانیندا هەستیش جۆریکە لەتاوان، خۆ لەم ڕۆژگاری جەهلەدا ڕۆشنبیرێك بوونی نییە هەر خۆمان بەهزرەوە هەڵواسیوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(عەلی وەردی) نووسەر و هزرڤانی بەناوبانگی عێراق**

● هەقیقەت رەها نییە و ڕێژەییە، تاکە پێوەری هەقیقەتیش مرۆڤە بە سەرجەم بەرژەوەندی و ئارەزووە شەهوانییەکانییەوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئاستی ڕۆشنبیری کەسێك بەوە دەپێورێت تا چەند ئەو ڕایانەی قبووڵە، کە پێچەوانەی ڕاکانی ئەون.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(عەبدولکەریمی مودەڕیس) نووسەر و زانای ئاینی گەورەی کورد**

● یەکێك لە بەڵگەکانی بێ ئەقڵی ئەوەیە، کە مرۆڤ بەخۆی سەرسام بێت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(عادل ئیمام) ئەکتەری کۆمیدی میسر**

● باوکم دوو ژنی هێنا، بەهۆی ژنی یەکەمییەوە سێ جەڵتە لێی دا و بەهۆی ژنی دووەمییەوە مرد.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(عیسا) پێغەمبەری ئاینی مەسیحییەکان**

● بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ خەڵکی بکە، کە دەتەوێ خەڵکی مامەڵەی تۆی پێ بکەن.

*****

● بۆ یارمەتیدانی کەسانێك، کە پێویستیان بە یارمەتی تۆیە، ئەگەر بەدەنگیانەوە نەچیت، هیچت زیاتر نییە لەو ئاژەڵەی، کە تێناگات و هەست ناکات.

*****

● ئەوەی دەچێتە دەمەوە مرۆڤ پیس ناکات، بەڵکو ئەوەی لە دەم دێتە دەرەوە مرۆڤ پیس دەکات.

**(عەباس مەعرووفی) نووسەر و شانۆنووس و ڕۆژنامەنووسی ئێران**

● چاوەڕوانی شتێکی خراپ نییە، درزێکە لە ئومێد و هیوا، لە نائومێدییەکی بێ سنوور من چاوەڕوانیم لە هەواڵێکی خراپ پێ خۆشترە.

*****

**(عەرەب شەمۆ) یەکەمین ڕۆماننووسی کورد**

● هیچ دەرفەتێك لە دەست مەدە بۆ خوێندنەوە، تەنانەت جنێوی سەر دیوارەکانیش بخوێنەوە هیچ نەبێت فێری ئەوە دەبیت هەمان جنێو دووبارە نەکەیتەوە.

*****

**(عومەری کوڕی خەتاب) دووەم خەلیفەی ڕاشدین**

● زانیاریی بەدەستبهێنە و فێری خەڵکی بکە.

*****

● ئیمانداری زۆرم بینیوە لە پێناو گەیشتن بە بەهەشت تاوانی وایان ئەنجامداوە، کە دۆزەخ بۆ ئەوانە وەڵامدانەوەیەکی زۆر کەمە!..

*****

● ئەگەر ڕاستگۆیی دامبەزێنێ پێم خۆشترە، لەوەی درۆزنی بەرزم بکاتەوە.

*****

● خودای گەورە لەو کەسە خۆش نابێت، کە لە خەڵك خۆش نەبێت.

*****

**(عەبدولاّ عزام) پیاوی ئاینی ئوردنی**

● ئەگەر ویستت نیشتمانەکەت ڕزگار بکەیت، دە فیشەك بخەرە تفەنگەکەتەوە، نۆیان بۆ هاونیشتمانە ناپاکەکانت دابنێ، فیشەکەکەی دیکەیش بەسە بۆ دوژمنەکەت.

*****

**(عەزیز نەسین) نووسەری ناوداری تورکیا**

● مرۆڤ نە گۆشتی دەخورێت و نە پێستەکەشی بەکەڵك دێت، دەی ئەگەر زمانی شیرین نەبێت بۆ قسەی چاك مرۆڤ چ سوودێکی هەیە؟.

*****

**(عەلی محەمەد ئەفغانی) نووسەری ناوداری ئێران**

● لە ژیاندا، هەندێ کات و سات دێتە پێش، کە مرۆڤ نە کەسی خۆشدەوێ و نە دەشیەوێ کەس ئەوی خۆشبوێ!..

*****

**(عەتیق رحیمی) رۆماننووسی ئەفغانستان**

● کۆمۆنیستەکان دەساڵ هەوڵیاندا خەڵك لە خوا دوور بخەنەوە نەیانتوانی، کەچی پارتە ئیسلامییەکان بە ساڵێك ئەوەیان کرد.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(عەبدولرەحمان سدیق) نووسەر و رووناکبیری کورد**

● خانووەکانمان تازەن، بەڵام خۆمان هەر کۆنین، باڵەخانەکانمان بەرزن، بەڵام هیمەتمان نزمە، شەقامەکانمان درێژن، بەڵام پیاسەمان زۆر کورتە، پەرداخەکانمان نوێن، بەڵام ئاومان خاوێن نییە، کاتژمێرەکانمان تازەن، بەڵام رێزلە کات ناگرین.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

## پیتی (غ)

### (غادە سەممان) ئەدیب و ڕۆماننووس و شاعیری سوریا

● ئەوەندە بێ ئەقڵ نیم، کە دڵخۆش بم.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● درۆیەکی سیاسیانەی جوان (بستێك لە خاکی نیشتمانەکەم بە دنیا نادەم).

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

خەڵکانێك هەن، کە کاتێك پێیان دەگەیت، وا هەست دەکەیت، کە گەیشتوویت بە خودی خۆت!.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

### (غەسان کەنەفانی) نووسەر و ڕۆماننووسی فەلەستین

● ئافرەت جۆرە سروشتێکی هەیە، کە بەتەواوەتی ئاشقی پیاوێك بوو ئیدی نوێژی مردوو لەسەر هەموو پیاوانی دیکەی دنیا دەکات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● نانەکەت دەدزن، دواتر پارچەیەکت دەدەنێ و ئینجا داوای ئەوەت لێدەکەن سوپاسیان بکەیت بۆ بەخشندەییان، چەندە بێ ڕەوشتن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

## پیتی (ف)

### (فرۆید) پزیشكی دەروونناسیی نەمسایی

● من هەمیشە لە دەرەوەی دەروونمدا بە دوایی هێز و متمانەدا دەگەڕام، بەڵام بۆم دەركەوت بە درێژایی ئەو كاتە لەناو ناخمدا بوون.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● شاعیر و فەیلەسووفەكان پێشم كەوتن لە دۆزینەوەی نا ئاگایی، بەڵام من ئەوەم دۆزییەوە، كە ئەو شێوازە زانستییە چییە، كە دەتوانرێت لێكۆڵینەوەی نائاگایی پێ بكرێت!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● نائاگایی برێتییە لە بازنەیەكی گەورە و لەناویدا بازنەیەكی بچووكتر لە خۆی دەگرێت، ئەویش ئاگاییە، هەموو شتێكی ئاگایی، هەنگاوی سەرەتایی لە نائاگاییەوە بووە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● هیچ نەریت و بنەمایەك نییە، كە بە كەڵكی هەمووان بێت، هەركەس دەبێت بۆ خۆی ڕێگەی ڕزگاری خۆی بدۆزێتەوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● سی ساڵ لێكۆڵینەوەم لە بارەی ژنەوە كرد، ئێستەش نەمزانی ئەو بوونەوەرە چی دەوێت!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● شەیتان ئافرەتی قووتدا، بەڵام بۆی هەرس نەكرا.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● مرۆڤ زۆریش لەوە بێ ڕەوشتترە، کە خۆی وێنای دەکات.

* * * * *

● ژیان ڕێگەیەکی بازنەییە بەرەو مەرگ.

* * * * *

● غەریزەکان لە مرۆڤدا بەهێزترن لە ئەقڵ.

* * * * *

● شارستانییەت و سروشتی ڕەسەنی مرۆڤایەتی دوو شتی دژ بە یەکن، چونکە مرۆڤ وەك ئاژەڵ ملەکەچی ڕەمەك و پاڵنەرە سێکسی و شەڕخوازییەکانییەتی.

* * * * *

● ئەو پیاوانە زۆرینەی کۆمەڵگە پێك دەهێنن، کە لەدوایی ژن هێنانیان هاوڕان لەگەڵ ئەو پەندە کۆنە" (تەنها ژنی ئاقڵ و پیاوی گەمژە دەچنە نێو ژیانی هاوسەری).

* * * * *

**(فەروغی فەروخزاد) شاعیری ئێران**

● بێدەنگی چییە؟ جگە لە کۆمەڵێ قسەی نەوتراو!...

* * * * *

● قفڵی بێدەنگی مەدە لە لێوەکانم، لە کاتێکدا لەناو دڵمدا چیرۆکی باس نەکراو هەیە.

* * * * *

● ئای...چەند هێمن و پڕ لەخۆیایی ڕۆیشت...ژیانم!..

* * * * *

● هەندێك جار لەوانەیە درۆ ڕاست بێت، هەندێك جاریش ڕاستی درۆ!.

✽✽✽✽✽

● وەلێ بێ فریو خواردن ژیان زۆر سەختە.

✽✽✽✽✽

● لە هەمبەر زۆری خیانەتەکانت و شەرمەزار نەبوونت، هاتۆتە سەرم لە جیاتی تۆ خۆم بکوژم.

✽✽✽✽✽

**(فرانتس کافکا) ڕۆماننووس و نووسەری چیك**

● بۆ نا، لەوانەیە ئەم دنیایە خۆی دۆزەخی دنیایەکی دیکە بێت!..

✽✽✽✽✽

● زانست لە جێگەیەك سەرچاوە دەگرێت، ئێمە ڕێگەکەمان ون کردووە.

✽✽✽✽✽

● یەکەم نیشانەی دەسپێکی تێگەیشتن، خۆزگە خواستن بە مەرگە!..

✽✽✽✽✽

● کتێب، پێویستە ببێتە تەورێك بۆ شکاندنی دەریا و بەستەڵەکەکانی ناخمان.

✽✽✽✽✽

● خۆشەویستی، ئۆتۆمبێلێکی بێ عەیبە، بەڵام شۆفێر و سەرنشینەکانی عەیبدارن، ڕێگەش هەوراز و نشێوە!...

✽✽✽✽✽

● دەنووسم جیاواز لەوەی دەیڵێم، دەیڵێم جیاواز لەوەی بیری لێدەکەمەوە، بیردەکەمەوە جیاواز لەوەی دەبێت بیری لێبکەمەوە، ئەمانە هەمووی سەرچاوەکەی تاریکییەکی قووڵە.

✽✽✽✽✽

● تەنها مەرگ خامۆشی تەواو لە بەرامبەر پرسیارە بێ کۆتاییەکان و دڵەڕاوکێدا بەرقەرار دەکات.

**(فلۆرەنس سکۆفیل شن) نووسەری ئەمەریکایی**

● لە بیرت بێ، ئەگەر ملکەچی هەموو یاساکانی ژیان بیت، ئەوا چێژی ئاسوودەیی لە دەست دەدەی.

* * * * *

● پرسیاریان لە فلۆرەنس سکۆفیل شن کرد چۆن بەسەر ترسدا زاڵبین؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی: ڕووبەڕووی ئەو شتە ببنەوە، کە لێی دەترسن.

* * * * *

**(فۆرد) خاوەنی کۆمپانیایی (فۆرد)ی ئۆتۆمبیلی ئەمەریکایی**

● ڕۆژنامە بخوێنەوە: پێویستە لە نێوان دە کەسدا کەسێکی ڕۆژنامەنووس هەبێت.

* * * * *

**(فرانسیس والدر) ئەفسەری سوپای ئەمەریکا**

● هاوڕێی باش ئەو شتانەت پێدەڵێت، کە خۆت ناتەوێت بەخۆتی بڵێی.

* * * * *

**(فیدل کاسترۆ) شۆڕشگێڕ و سەرکۆماری پێشووتری کوبا**

● لەوە ناترسم دەرگەی دۆزەخم بە ڕوودا بکرێتەوە، بەڵام لە زیرەی پێنووسی ڕۆژنامەنووسان دەترسم.

* * * * *

● پارە لەتوانایدا هەیە دۆست و دوژمنت وەك ئەو سەگە بێدەنگ بکات، کە لە چاوەڕوانی پارچە گۆشتێك ئەو ناوەی پڕکردووە لەدەنگ !.

* * * * *

● ئەگەر هەمووان نیشتمانەکەی خۆیان خۆشویستبا، ئەوە هیچ وڵاتێك نەیدەتوانی هیچ وڵاتێکی دیکە داگیربکات، کە ئامادەباشیت تێدابوو بۆ بەرگری کردن لە نیشتمانەکەت ئەوە هیچ هێزێك ئەو توانایەی نییە ڕووبەڕووی نیشتمانەکەت ببێتەوە !.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

**(فیساگۆرس) فەیلەسووف و بیردۆز و گەردووونناسی یۆنان**

● کەسێك جلوبەرگی ڕازاوەی لەبەردا بوو قسەی بێ واتاو بێ تامی دەکرد پێیان گوت یان جلوبەرگەکانت وەك قسەکانت لێبکە، یان قسەکانت وەك جلوبەرگەکانت لێبکە.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

● یان بێدەنگ بە، یان قسەیەك بکە لە بێدەنگی باشتر بێ !.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

**(فیدریکۆ گارسیا لۆرکا) شاعیر و نووسەری شانۆیی و نیگارکێشی ئیسپانیایی**

● فریشتەکان، کە گۆرانی دەڵێن، وەك ئەوە وایە پەنجەم بۆ بژمێرن..
سەگەکان، کە دەوەڕن، وەك ئەوە وایە پەنجەم بۆ بژمێرن، هەزار سازی پێکەنین لە ناخمدا قووڵپ دەدەن..

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

● وەك چۆن نیگەرانی لەدایك بوونی خۆم نەبووم، نیگەرانی مەرگیشم نیم.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

**(فرێدریك ئینگڵس) فەیلەسوف و هزرڤانی بەناوبانگی ئەڵمانیا**

● لە وەهم بەولاوە هیچی دیکە نییە، کە پێی دەڵێن بەختیاری هاوسەرگیری.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

**(فرانسیس بیکن) فەیلەسووفی بەریتانیایی**

● گومانی خراپ لە هزری مرۆڤدا وەك بوونی شەمشەمە کوێرەیە لەناو باڵندەکاندا، هەموو کاتێك لەگەڵ نەمانی ڕووناکی و دەرکەوتنی تاریکیدا دێتە دەرو باڵ ڕادەوەشێنێت.

* * * * *

**(فردریکی یەکەم) پاشای کۆنی پروسیایی**

● مرۆڤ بە ڕووتی دێتە دنیاوە و، بە ڕووتیش دنیا جێ دەهێڵێ.

* * * * *

**(فرید ئەلن) ئەکتەری کۆمیدیای ئەمەریکایی**

● تەلیسکۆب دەتوانێت ئەستێرەیەك هەزار جار گەورە بکات، بەڵام ڕۆژنامەنووس دەتوانێت لەو باشتر گەورەی بکات.

* * * * *

## پیتی (ق)

**(قازی محەمەد) یەکەمین سەرکۆماری کوردستان**

● یەکەتیی و تەبایی لەنێوان خۆتان بپارێزن کاری نەشیاو مەکەن لە بەرامبەر یەکتری چاوچنۆك مەبن بە تایبەتی لە بەرپرسیارەتی و خزمەتکردندا.

❊❊❊❊❊

● خوێندن و زانست و پلەی زانیاریتان بەرنە سەرەوە و بۆ ئەوەی کەمتر فریوی دوژمنان بخۆن.

❊❊❊❊❊

● بۆ چەند رۆژێکی ژیانی بێ قیمەتی ئەم دنیایە خۆتان بە دوژمن مەفرۆشن، چونکە دوژمن جێگەی هیچ باوەر پێکردنێك نیە.

❊❊❊❊❊

● خیانەت بەیەکتری مەکەن نە خیانەتی سیاسی و نە گیانی و نە ماڵی و نە نامووسی، چونکە خیانەتکار لای خودا و خەڵك تاوانبارە خیانەت بە ڕووی خیانەتکاران دەگەڕێتەوە.

❊❊❊❊❊

● ئێوە لە هەوڵ و خەبات و تێکۆشان مەوەستن تا وەکو هەموو گەلانی دیکە لەژێر چەپۆکی دوژمنان ڕزگارتان دەبێت.

❊❊❊❊❊

● لە سەرەمەرگیشدا دڵم خۆشە، چونکە دەبینم ملم بە پەتی سێدارەوەیە و پێڵاوەکانم لەسەر سەری دوژمن بەرزترە.

❊❊❊❊❊

● من هەرگیز ڕێگە بە خۆم نادەم، کە خەڵکی بە بەرچاوی منەوە ئازار بچێژی.

● ئەوانەی ئێمەیان جێهێشت بە تەنها خیانەتیان لە نەتەوەکەیان نەکرد، بەڵکو پابەند نەبوون بەو سوێندەش، کە خواردبوویان کە تا دوا ساتەکانی ژیانیان لەگەڵ میللەتەکەیاندا دەبن.

* * * * *

● بۆ هەموو میللەتی کورد، خوشك و برا خۆشەویستەکانم کوڕ و کچە عەزیزەکانم دەپاڕێمەوە لەخوا ماڵئاوایی من ببێت بە ماڵئاوایی ئێوە لە ئازار و مەینەتییەکان، گەلە چەوساوە و عەزیزەکانی من، مردنی من با بێ ئیرادە و نائومێدتان نەکات بە مردنی من کورد نامرێت، ئەگەر لە پێناو میللەتەکەشمدا نەمرم یانی هیچم بۆ میللەتەکەم نەکردووە!..

* * * * *

**(قاسملۆ) سکرتێری تیرۆرکراوی حیزبی دیموکراتی کوردستان**

● باشترین پاداشت بۆ شەهیدان، درێژە پێدانی ڕێگەیانە...

* * * * *

● نابێت ڕێگە بدەین، دەنگی دوژمنانمان بەسەر هاوار و ناڵەی ئێمەدا زاڵبێت و بێدەنگی ئێمە زەمینە بۆ دەنگی ناحەزانمان خۆشبکات.

* * * * *

● بە پێخواسی بەناو ئاگردا دەڕۆم بۆ خەبات و بۆ هەرکوێیەك کە کێشەی کوردی لێ چارەسەر بکرێت، ڕێگەیەکە و خۆم هەڵمبژاردووە، مەگەر مە،گ بتوانێ ناچار بەدەستبەرداربوونم بکات، ئەگینا من ماندوو نابم.

* * * * *

**(قزلْچی) چیرۆکنووس و ڕۆژنامەنووسی کورد**

● گوێگرتن و ڕێزگرتن لە خەڵك پێویستە، بەڵام لە کۆمەڵگەی ئێمە پێچەوانەیە، کە زۆر ڕێزی کەسێکت گرت و گوێت بۆ گرت بە گەمژەت دەزانێ، بۆیە گوێ بە کەس مەدە و بۆ خۆت بژی.

پیتی (ڤ)

**(ڤۆلتێر) هزرڤان و ڕووناکبیری فەرەنسایی**

● بڕوام وایە هەر مرۆڤێك تەنها(١٥) خولەك بیر لە ڕێکخستنی ژیانی خۆی بکاتەوە و بۆ چاکسازی، ئەوا هەموو مانگێکی ژیانی لە مانگی پێشووتر خۆشتر و باشتر دەبێت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● هاوڕات نیم بەوەی، کە دەیڵێیت، بەڵام تامردن بەرگری لە مافت دەکەم بۆ ئەوەی هەرچیت هەیە بیڵێیی.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● کاتێك قسە دێتە سەرباسی پارە، ئەوە هەمووان لەسەر یەك دین و ئاینن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئەستەمە گەمژەکان ڕزگار بکەیت لەو کۆتوبەندانەی، کە شانازی پێوە دەکەن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● تاکە نهێنی ئافرەت بیپارێزێت، ئەویش تەمەنییەتی!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● لە پێناو پێشکەوتنی ئەورووپادا، پێویستە دوایەمین خشتی کڵێسا بەوپەڕی هێزەوە بکێشین بە سەری دوایەمین قەشەدا.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئەو کەسەی پێت دەڵێت باوەڕ بهێنە بەوەی من باوەڕم پێیەتی گەر نا ئەوا خودا سزات دەدات، مافی ئەوەی نییە پێت بڵێت باوەڕ بهێنە بەوەی من باوەڕم پێیەتی گەر نا دەتکوژم.

*****

● ڕۆژنامە هۆی تازەکردنەوەی جیهانە و، تەمی نەزانین دەڕەوێنێتەوە.

*****

**(ڤیکتۆر هۆگۆ) ڕۆماننووسی مەزنی فەرەنسایی**

● بەختەوەر ئەو کەسەیە یەکێك لەو شتانەی هەبێت، کتێب یان هاوڕێی ئەهلی کتێب.

*****

● هاوڕێکەم ئاگەداری جوانی ئافرەتان بە، چونکە لە کوێ ناسکی ئەوان دەستی پێکرد، لەوێ کۆیلایەتی ئێمە دەستپێدەکات.

*****

● نازانم تا چەند ڕاستە یاخود بوختان، بەڵام دەگێڕنەوە گوایە لە کۆندا مرۆڤەکان توانیویانە بە وەفا بن، لە ڕاستیدا من گومانم هەیە وا بووبێت، بەڵام چونکە خۆم لەو سەردەمە نەژیاوم ناتوانم بڵێم درۆیە!..

*****

● ئافرەت ئەو گرفتەیە، کە دەبێت پیاو زۆرانی لەگەڵدا بگرێت.

*****

● هەرگیز لەناو بوونەوەرەکاندا دروستکراوێك، کە بۆ بوون بە کۆتر دروستکرا بێت، نابێتە داڵاش، ئەم تایبەتمەندییە لەناو هیچ لە دروستکراوەکاندا نابینرێت جگە لە مرۆڤ!..

*****

## پیتی (ك)

### (کانت) فەیلەسووف و هزرڤانی ئەڵمانیا

● لە مامەڵکردن لەگەڵ خەڵکیدا وا هەڵسوکەوت مەکەن، کە گوایە ئامرازن، بەڵکو وا هەڵسوکەوت بکەن کە ئامانجن.

*****

● مرۆڤە ناتوانێت ئەدای ئەرکی خۆی بکات گەر ئازاد نەبێت.

*****

● تێکەڵی لەگەڵ خەڵکیدا دانایت زیاد دەکات، بەڵام تەنیایی قوتابخانەیەکی ئەفسوناوییە!..

*****

● ئێمە دەبێت ئەخلاقی بین، چونکە ئەخلاقی بوون، هاوتایە لەگەڵ ئەقڵانییەت.

*****

● با ورەی سەربەستیت ببێت و ڕێز بۆ ئازادی و جۆراوجۆری کەسانی دیکەیش دابنێ، چونکە پلەوپایەی مرۆڤایەتی لە ئازادی و خۆئاینی دایە.

*****

● من تەنها لەبوونی خۆم گومانم نییە، من لە خۆم و بیرکردنەوەکانیشم بەگومانم!..

*****

● فەلسەفەی زانست لە نێوان هەر جۆرە مەعریفەیەك لەگەڵ ئامانجە بنەمایەکانی ئەقڵی مرۆییە و فەیلەسووف دروستکەر و پیشەگەری ئەقڵ نییە، بەڵکو یاسا دارێژەری ئەقڵی مرۆڤە.

*****

● ئارەزووەکانی مرۆڤ کۆتاییان بۆ نییە، هەر کات ئارەزوویەکی بەدی هات، ئارەزوویەکی دیکەی هەیە.

**(کۆنفۆشیۆس) دانای کۆمەڵایەتی و ڕەوشتمەندی چین**

● گەر هەڵەیەکت کرد و ڕاستت نەکردەوە، ئەوسا پێی دەوترێت هەڵە.

*****

● ئەگەر سەرکردە باش بێت، کێ دەتوانێ گەندەڵی بکات؟!.

*****

● ئەوەی بۆ خۆت بە چاکی نازانیت، بۆ خەڵکیش بەچاکی مەزانە.

*****

● گەورەترین شکۆ و شانازی ئێمە لە هەرگیز شکست نەخواردنماندا نییە، بەڵکو لە هەستانەوەی هەموو جارێکی کەوتنماندایە.

*****

● چۆلەکە، کە مردنی نێزیك دەبێتەوە، جیکە جیکی پڕ خەماوییە، مرۆڤ، کە نێزیك مردن دەبێتەوە، وشە و قسەکانی خۆش دەبێت.

*****

● ئافرەت پێش شوو کردنی دەگری، بەڵام پیاو لە دوای ژن هێنان.

*****

● ئەوەی کە بیر لە داهاتوو ناکاتەوە، ئەوا داهاتووی بۆی دەبێت بە خەم و گیرۆدەی دەکات.

❊❊❊❊❊

● مرۆڤ ناتونێت هیچ زانیاریی و ماریفەتێك بە دەست بهێنیت، تا فێری بیرکردنەوە نەبێت.

❊❊❊❊❊

● بەڕاستی ژیان سادەیە، بەڵام ئێمە سوورین لەسەر قورسکردنی.

❊❊❊❊❊

● کە ناتوانین چاکە بۆ زیندوو بکەین، کە لە پێش چاومانن، چۆن دەتوانین چاکە بۆ مردوو بکەین.

❊❊❊❊❊

● فێرنەکردنی ئەو کەسەی، کە ئامادەیی فێربوونە بە هەدەردانی مرۆڤێکە، فێرکردنی ئەو کەسەی، کە ئامادەی فێربوون نییە بەهەدەردانی زانستە.

❊❊❊❊❊

**(کارل گۆستاف یونگ) لێتوژی دەروونناسیی سویسرایی**

● نابێت ئێمە وا تێبگەین، کە لە جیهان گەیشتووین تەنها لە ڕێگەی ئەقڵەوە، بەڵکو بەهەمان ئەندازە لە ڕێگەی هەستەکانمانەوە هەڵی دەسەنگێنین، لەبەرئەوە بڕیاری ئەقڵ تەنها نیوەی ڕاستییەکانە و ئەگەر ڕاستگۆیانە لێبڕوانین ئەوا ئەو تێگەیشتنەیش، کە پێی دەگەین ناتەواوە.

❊❊❊❊❊

● هەتا تۆ نائاگایی دەکەیت بە ئاگایی، ئەو ژیانی تۆ ئاڕاستە دەکات و تۆش ناوی دەنێیی چارەنووس.

❊❊❊❊❊

**(کیم جۆن ئۆن) سەرۆکی کۆریای باکور**

● پەروەردەی نا ڕێکوپێك ئەوەیە، کە کاتێك بتەوێ هەر کارێك بکەی دەستت لێی نەگەڕێتەوە!.

* * * * *

**(کارلۆس فۆینتس) ڕۆماننووسی مەکسیك**

● لەودیو هەر زەردەخەنەیەکەوە خراپەیەك و لەناو هەر نیگایەکی خۆشەویستیدا شەڕێك خۆی مەڵاس داوە.

* * * * *

**(کاشمە ئازاد) نووسەری کورد**

● گەمژەیی مرۆڤ لەوەدایە، بۆ گەیشتن بە ئەشقێکی پووچ هەموو شتێك وێران دەکات، تەنانەت خۆشی!..

* * * * *

● یەخەی دنیا بەردەن، ئەوە خۆمانین، کە یاری بە یەکدیی دەکەین نەك ژیان.

* * * * *

● دەترسام ڕۆژێ بێیت و بۆنی بێگانەیەکت لێ بێت، بەڵام ئێستە بۆنی بێگانە بوونی خۆت ڕۆژە ڕێیەك دەڕوات ...

* * * * *

● گەمژەترین ئافرەت ئەو ئافرەتەیە، کە داوا دەکات لەگەڵ پیاودا یەکسان بێت، چونکە بەمە دەیسەلمێنێ، کە پیاو شتێکی لە ئافرەت زیاترە، کە لە بنەڕەتدا وا نییە!..

* * * * *

● ئێمەی مرۆڤ جێی بەزەیین ئاخر تەنها لە دوو ساتدا خۆش دەویسترێین، کاتێك کە لە دایك دەبین و کاتێك لەسەرە مەرگداین دەنا لە نێوان ئەو دوو ساتەدا گورگ ئاسا بەردەبینە ڕۆح و جەستەی یەك..

* * * * *

● کردنی زەردەخەنەی ساختە بە ڕووی دۆستاندا وەك ئەوە وایە، تەنەکەی زەردیان بە نرخی زێڕ پێ بفرۆشیتەوە.

* * * * *

● کە ویژدانت مرد .. ئیتر ناوی میهرەبانی مەهێنە، فرمێسکی سینەماییانە هەڵمەڕێژە سەر زەوی، ڕیش مەکە و ناوی دین و خودا مەهێنە، باسی ئیشق و حیکمەتەکانی ژیان مەکە، تەنها دەمت داخە و هەوای خوا پیس مەکە.

* * * * *

## (کورووشی گەورە) پاشای ئێران

● تەواوی سوپاسەکانم بۆ کەسێکە، کە پێویستی بە من نەبوو، بەڵام لەبیری نەکردم!.!..

* * * * *

## (کیریلۆف) زانای بیرکاری ڕووسیایی

● تەنیا کاتێك دەگەینە ئازادیەکی تەواو کە ئیتر هیچ گرینگ نەبێت بۆمان کە بژین یان نا ئەمە ئامانجی هەموو کەسێکە.

* * * * *

## (کلایف جەیمس) شاعیر و هونەرمەندی ئوسترالیایی

● ڕۆشنبیری گەندەڵ هێندەی بۆمبێکی کۆمەڵکوژ مەترسیدارە، هەر بۆیە ڕۆشنبیری ڕاستەقینە هەمیشە لە دەرەوەی دەسەڵاتە، چونکە دەسەڵات هەمیشە

لە هەوڵی کپکردنی دەنگی کەسانی ڕۆشنبیرە، ئەوەش وای لێدەکات هەموو ڕێگەیەك تاقی بکاتەوە بۆ بێدەنگ کردنیان ، کاتێکیش ڕۆشنبیر بێدەنگ دەبێت یانی بووە بەگەندەڵ!..

*****

**(کارل پۆپەر) فەیلەسووفی زانستی نەمسایی**

● لە مرۆڤەکان دوور کەوتوومەوە، بۆ ئەوەی چیدی بیرم نەکەوێتەوە منیش مرۆڤم!. چونکە بە ڕاستی لەو کاتانەدا خراپ تەریق دەبمەوە.

*****

**(کریس کۆچێرا) ڕۆژنامەنووسی ناوداری فەرەنسایی**

● ئێران، سوریا، عێراق، تورکیا، دوژمنە بچووکەکانی کوردن، دوژمنە گەورەکەی کورد، کورد خۆیەتی

*****

## پیتی (گ)

### (گاندی) سەرۆکی حزبی کۆنگرەی هیندستان

● مرۆڤی لاواز هەرگیز ناتوانێ لە کەس ببورێ، لێبووردەیی تایبەتمەندی مرۆڤە گەورەکانە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● کاتێك کۆمەڵگە بە سیاسی دەکرێت، درۆ تەنگ بە راستی هەڵدەچنێت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● بیرتان نەچێت منیش یەکێکم لە ئێوە نەك زیاتر، بۆیە بەچەپڵە و پیاهەڵدانەکانتان وام لێمەکەن دەماری خۆ بەگەورە زانین لە ناومدا دروست ببێت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● من ڕقم لە جەنگە چۆن دەزانم تەنها سەرمایەدار و سیاسییەکان تێیدا قازانج دەکەن و هەژارەکان تێیدا دەمرن و نیشتمانیش تێیدا کاول دەبێت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ڕێگە بە هەموو کەسێك نادەم بەپێی پیسەوە بەناو مێشکمدا بڕوات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● کاتێ ژنان خۆیان ئارایشت دەکەن بۆ ڕاکێشانی سەرنجی پیاوان، دەبێت لە داخا بمرن، کە ژنن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ڕاستگۆیی باشترین سیاسەتە، کە بەداخەوە هیچ سیاسەتمەدارێك ناتوانێ پێڕەوی بکات!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● تەنها کەسێك کە بۆی هەیە قسە لەسەر ئەدەب و پەروەردەی باڵای ئەخلاقی خۆی بکات، کە لە ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ خەڵکی بێ ئەدەبدا، بە ئەدەب بمێنێتەوە.

● من هیچ گوناحێك لەوە بەگەورەتر نازانم بەناوی خواوە بێ گوناحەکان بخەیتە ژێر فشار و بیان تۆقێنی بەدۆزەخ.

* * * * *

●ناوبانگ، بەبێ کەسایەتیی ئیتر ئەستەم و ترسناکە.

* * * * *

● کەسانێك هەنە تەنیا لەبەر وتەی خەڵکی جلی گران بەها دەکڕن و ورگیان برسی دەهێڵنەوە و خێزانەکانیان لە برسا دەکوژن، ئەوان تەنها بۆ فریوی چاوی خەڵکی هەموو ژیانیان بەو شێوەیە لەناو دەبەن.

* * * * *

● جیاوازی لە بیروڕادا نابێ ببێتە هۆی ناکۆکی، چونکە ئەگەر وا بێ، من و ژنەکەم خوێنەخۆرەی یەکترین.

* * * * *

● هەرکەسە و بەرپرسە لە ژیانی خۆی، من لە جیاتی ئەو کەسانە شەرمەزار و تەریق دەبمەوە، کە خۆیان هەڵدەقورتێنن لە بیروباوەری کەسانی دیکە، پێویستە فێری ئەوە ببین تەنها خاوەنی خۆمانین و بەرپرسیاری ژیانی کەسی دیکە نین و ناشتوانین ببین.

* * * * *

● ئاسمان هەرچەندە گەورە بێت، کە مانگی تێدا نەبوو هەر تاریکە، مرۆڤیش هەرچەندە گەورە بێت، کە ڕەوشتی تێدا نەبوو هەر بچووکە.

* * * * *

● من بڕوام بەو کەسانە نییە، کە بانگەشە بۆ بیروباوەڕیان دەکەن، بە تایبەت ئەوانەی دەیانەوێت خەڵك بێننە سەر دینی خۆیان، بیروباوەڕ بە گوفتار نییە بەڵکو بە کردارە، کردارەکانی هەر کەسێك بۆ خۆیان دەبن بە هۆکاری بانگەشەکردن بۆ بیروباوەڕەکانی.

*****

**(گوڵشیفتە فەراهانی) ئەکتەری ئێران**

● پارە خۆشبەختی لەگەڵ خۆی ناهێنێ، بەڵام بێ پارەیی حەتمەن بەدبەختی لەگەڵ خۆی دێنێ !.

*****

**(گابرێل گارسیا مارکیز) ڕۆماننووسی ناوداری کۆڵۆمبیایی**

● ئەگەر خودا ڕەزامەندی بدات، جارێکی دیکە کەمێك ژیانم بە بەردا بکاتەوە، باڵ بە منداڵەکان دەبەخشم تا بتوانن بە تەنها بفڕن.

*****

● هەر کاتێ ویستت وەرەوە، من تەقریبەن هەمیشە بە تەنیام.

*****

● هەندێ کەس هەن تا سەد ساڵی تەمەنیان دەگوزەرێنن، بەڵام هێشتە تێنەگەشتوون خۆشەویستی و مرۆڤ دۆستی هەرگیز بە پارە ناکڕدرێن.

*****

● خۆشم دەوێی، نەك بۆ کەسایەتییەکەت بەڵکو بەبۆنەی کەسایەتییەك، کە من لە کاتی لەگەڵ تۆ بووندا هەستی پێ دەکەم.

*****

● لە ماوەی یەك خوولەك، دەکرێ کەسێك وردوخاش بکەی!. لە ماوەی یەك سەعاتدا، دەکرێ کەسێکت خۆشبوێ، لە ماوەی ڕۆژێکدا، دەکرێ ئاشق بی، بەڵام تەمەنێکی درێژت دەوێ، تا کەسێك لەبیربکەی.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

●ئەگەر خوا ژیانێکی دیکەم پێ ببەخشێتەوە، جلوبەرگی سادە لەبەر دەکەم و لەسەر زەوی ڕێدەکەم، نەك تەنیا بە جەستەی ڕووتەوە، بەڵکو بە ڕۆحێکی ڕووتیشەوە ڕێدەکەم..

●هەر کەسێك پرسیاری ئەوەم لێ بکات بۆچی ژنم نەهێناوە؟ تاکە وەڵامی ڕاستگۆیانە ئەوەیە" سۆزانییەکان بواریان نەداوم.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● هەست بە هەر شتێك دەکەیت دەری ببڕە، ئەوەی بیری لێ دەکەیتەوە ئەنجامی بدە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● شووکردن لەپێناوی پارە، خراپترین جۆری لەشفرۆشییە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئەوە هەڵەیە ئەگەر پێمان وابێت، هەر کە پیر بووین، ئیدی ناتوانین ئاشق بین، ڕاستییەکەی ئەو کاتە پیر دەبین، کە دەست لە ئەوین هەڵدەگرین.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

## (گیڤارا) شۆڕشگێری ئەرژەنتین

● هەر شتێك کە لەدەست دەڕوات، لێی گەڕێ با بڕوات، شتێ کە بە پاڕانەوە هۆگر بووە نامەوێ، هەرچییەك بێت هەتا بگرە ژیانیش بێت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئەو کەسەی، کە وڵات دەفرۆشێت و ناپاکی دەکات، هەروەك ئەو کەسە وایە، کە دزی لەماڵی باوکی دەکات و دەیداتە خواردن بۆ دزەکان، لەم بارەدا نە باوکی لێی خۆش دەبێت و نە دزەکانیش پاداشتی دەدەنەوە.

* * * * *

● من ئازادی بەخش نیم، ئازادی بەخش، بوونی نییە، خەڵك دەبێت خۆیان ئازادی خۆیان بەدەست بهێنن.

* * * * *

● کڵاوەکەی سەرم بۆ ئەو کەسە لە سەرم دادەکەنم، کە هێرش دەکاتە سەرم، وەك ڕێزێکیش بۆ ئازایەتییەکەی لەسەر گۆڕەکەی دادەنێم.

* * * * *

● تۆ کە باوەڕت بە بەڵێنی سیاسییەکان کرد، کە بەر لە هەڵبژاردنیان پێتی دەدەن، کەواتە تۆ گەمژەیت و سەرێکی بێ مێشکت هەیە، چونکە سروشتی سیاسەتمەداران بەو جۆرەیە ناڵێن ئەوەی لە دەسەڵاتماندا هەبێت دەیکەین، بەڵکو بۆ گەیشتن بە دەسەڵات دەڵێن هەموو شتێك دەکەین!..

* * * * *

● کاتێك من دەمرم مەگرین، ئەو کارانەی من دەمکرد ئەنجامی بدەن ئەو کات من لە دڵ و دەروونی ئێوەدا بەردەوام دەبم لە ژیان.

* * * * *

● لە لام وابوو، خەم دەشێ ببێتە هاوڕێ، بەڵام بڕوام نەدەکرد، ببێتە نیشتمانێك، تێیدا نیشتەجێ ببین و بە زمانەکەی قسەبکەین و ببینە هەڵگری ناسنامەکەی.

* * * * *

● هەر سێ بەشی ئەخلاق شۆڕشە لە دژی دەسەڵاتێك، کە هەموو شتێکی نیشتمان تەنها بۆ خۆی پێ حەڵاڵە و بە ڕەوای دەزانێت.

* * * * *

● هەموو خەڵك نیشتمانێکیان هەیە تێیدا دەژین، تەنها ئێمە نەبێ نیشتمانێکمان هەیە تیاماندا دەژی.

* * * * *

● سوپاس بۆ ئەو کەسەی فێری کردم لە کۆتایی هەموو ڕێزگرتنێکی لە رادەبەر، ئەنجامەکەی سووکایەتیی پێکردنە.

* * * * *

● ئێمە ئەو مافەمان نییە باوەڕ بەوە بهێنین، کە ئازادی بەبێ تێکۆشان بەدەست دێت.

* * * * *

● هەژاران و چەوساوەکان لە کوێ بن، من لەوێم و لە بەرامبەر دوژمن و جەلادەکانیان دەبمە ئەژدیها.

* * * * *

● ئەگەر هاتوو ئێمە شکستمان هێنا، لەناو مردووەکاندا بەدوای مندا بگەڕێن، چونکە لەناو دیلەکاندا من نادۆزنەوە.

* * * * *

● شۆڕشگێڕی ڕاستەقینە کەسێکە، کە دوژمن لە تەرمەکەشی دەترسێت.

* * * * *

● کۆمەڵگەیەك چی لێ چاوەڕوان دەکرێت ماڵ و سامان کۆ بکاتەوە، بەڵام مرۆڤایەتیی لەدەست بدات.

* * * * *

● ئەو ڕۆشنبیرەی بێ دەنگی هەڵدەبژێرت، زۆر لەو دیکتاتۆرە خراپترە، کە ڕێچکەی کوشتن پێڕەو دەکات دژی گەلەکەی.

❊❊❊❊❊

● پێتان بڵێم قورسترین پێکەنین چۆنە؟، کاتێك هاوڕێیەکت غەدرت لێ دەکات یان بە جێت دەهێڵێت.. بەڵام تۆ پێدەکەنیت تەنها بۆ ئەوەی بزانێ، کە بە بێ ئەو دەژیت.

❊❊❊❊❊

● بە بڕوای من، ئێمە ڕۆژێك لە ناودەچین، کە ملکەچی دەسەڵاتێك بین بەتەنها گەنج لە بیرکردنەوەیدا نەبێت.

❊❊❊❊❊

● ڕوومەتم هەست بە ئازاری هەموو زلەیەك دەکات، کە ئاڕاستەی هەر زۆرلێکراوێك دەکرێت لە دنیادا، کەواتە لە هەر کوێیەك زۆرداری هەبێت ئەوێ نیشتمان منە.

❊❊❊❊❊

●جەژنی من ڕۆژێکە، کە ڕەنج و کۆششی ساڵێکی هەژارێك، خوانی ئێوارەیەکی پادشایەك نەبێ.

❊❊❊❊❊

**(گوڵتان کشاناك) سیاسەتڤان و پەرلەمانتاری کوردستانی باکور**

● کوردستان باشترین و جوانترین شوێنی دنیایە، ئەگەر وا نەبووایە هەموو دنیا داگیری نەدەکرد.

❊❊❊❊❊

● ئێرە کوردستانە و خاکی کوردانی ئاریە، یان دەیکەین بە گۆڕستان بۆ داگیرکەران یان دەیکەین بە بەهەشت بۆ ئاشتی.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(گۆتە) فەیلەسووف و شاعیر و ڕۆماننووسی ئەڵمانیایی**

● زۆرجار بێدەنگی جوانتر لە ئاخاوتن نهێنییەکانی دڵت دەدرکێنێت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● هیچ شتێك نییە هێندەی گومانبردن بەکەسانی دیکە خراپ بێت، گومان خەڵکی لێك جیادەکاتەوە، ژەهرێکە کە دۆستایەتی و خۆشەویستی ناهێڵێ، دەبێتە هۆی جیابوونەوەی جوانترین پێوەندییەکانی مرۆڤ.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● بە زوویی ڕۆژگاری ڕەخنە و دۆزینەوەی کەموکوڕی کۆتایی دێت بە هۆی پێشکەوتنی شارستانییەوە، ئازادی بیرکردنەوەیە، کە بە تەواوی واتا لە جیهاندا حوکم دەکات و هەموو کەس دەتوانێت بە دڵی خۆی و بە فەلسەفەی خۆی بوونی خۆی ببینێت.

● مرۆڤ گەر خۆی لە پایەی خۆی بەرزتر دابنێ هەڵەیەکی گەورەیە دەیکات، گەر خۆشی نزمتر دابنێت هەڵەیەکی گەورەتر دەکات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئەو کەسەی لێبوردە نییە بەرانبەر بە خەڵکی، بەدەستی خۆی ئەو پردە دەڕوخێنێ، کە دەبێ ڕۆژێ لە ڕۆژان بەسەریدا بپەڕێتەوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ژیانی پیاوی تەوەزەل مردنێکی درەنگ و زوویییە، چونکە ئەوەی کەڵکی نەبێت بۆ کەس هەر لە خۆیدا مردووە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(گارودی) فەیلەسووف و نووسەری فەرەنسایی**

● ئەگەر مارکس بیزانیایە، کە ئیسلام خاڵی سەرەتای ئەوەیە: چینی چەوساوە ڕزگار بکات لەژێر چەپۆکی خوێن مژەکاندا، ئیتر بێ چەندوو چوون بڕوای دەهێنا.

*****

**(گوڵتان کایا) هاوسەری ئەحمەد کایای هونەرمەندی مەزنی کورد**

● من ناگەڕێمەوە بۆ تورکیا تا ئەو دەمەی تورکیا نیشتمانی (ئەحمەد کایا) ئازاد دەکات، لەهیچ کامێك لەو هونەرمەندانەش نابورم، کە سووکایەتیان بە کایای هاوسەرم کردوو وایان کرد ڕابکەین بۆ پاریس و خەڵك بە خاین و سیخووڕ ناومان بەرێت، گوناحی (ئەحمەد کایا) چی بوو؟، جگە لەوەی دەیەویست بە زمانی دایکی گۆرانی بڵێت و کوردستان بە ئازادی ببینێت؟.

*****

## پیتی (ل)

### (لەیلا زانا) سیاسەتڤانی کوردستانی باکور

● من نیشتمانی خۆم هەرگیز بە جوانی مانگ بەراورد ناکەم، ڕەنگە مانگ هەر لە دوورەوە جوان بێت و لە نێزیکەوە شتێکی دیکە بێت.

❊❊❊❊❊

● سوێند بەو دایکەم کە منی هێناوەتە ژیان، ئەگەر من دوژمنی کورد بوایەم تەنها بە بینینی (هەڵەبجە) لە شەرم و لە ئاست بێویژدانیم خۆم دەکوشت، بەڵام دوژمنانی کورد لە ئاسن و بەردن و هیچ شتێکیان ناچێتەوە سەر مرۆڤ!..

❊❊❊❊❊

### (لودویگ ڤینگنشتاین) فەیلەسووفی نەمسایی

● هەرگیز لەسەر بەرزاییە ڕووتەنەکانی زیرەکی مەمێنەرەوە، بە ناو دۆڵە سەوزەکانی گەمژەییدا وەرە خوارێ.

❊❊❊❊❊

### (لینین) فەیلەسووف و دامەزرێنەری یەکەتیی سۆڤیەتی جاران

● شۆڕش لە وڵاتە دواکەوتووەکان چ زوو بێت چ درەنگ هەر دەبێت هەڵگیرسێت.

❊❊❊❊❊

### (لەتیف هەڵمەت) شاعیری یاخی کورد

● ڕێگەی گەڕانەوە بۆ جیهانی منداڵی لە کوێیە؟!.

❊❊❊❊❊

● کە دایکم مرد لە ڕێگەی گۆڕستان منداڵیم بزر کرد!...

## (لوقمانی حەکیم) پەیامبەر

● کوڕی خۆم گەر دەتەوێت خوا ڕەحمت پێ بکات، تۆش ڕەحم، بە خەڵك بکە.

* * * * *

● ئەگەر نێزیکترین کەست ناپاکیی لێ کردی تۆ ناپاکیی لێ مەکە، بەڵکو چاوەڕوان بە تا پشتت لێ بکات، ئەوکات لەسەر پشتی بنووسە: منیش دەمتوانی ناپاکیت لێ بکەم، بەڵام ڕەوشتم ڕێگەی پێ نەدام.

* * * * *

● کوڕی شیرینم ئەگەر ویستت هاوڕێیەتی کەسێك بکەیت لەپێشدا تووڕەی بکە، ئەگەر بە ویژدان بوو لە کاتی تووڕەبوونەکەیدا ئەوا هاوڕێیەکی باشە، ئەگینا لێی دوربکەوە یاخۆ خۆتی لێ بپارێزە.

* * * * *

## (لیۆناردۆ داڤینچی) نیگارکێش و پەیکەرتاش مەزنی ئیتاڵیایی

● مرۆڤ سروشتێکی دووفاقی هەیە، لەبەرئەوەی لە لایەکدا ئاژەڵێکی نێو مێگەلە، لە لایەکی دیکەوە ئەگەر پێوەندییەکانی بە مێگەل لە دەست بدات، بە تەنیا و گۆشەگیر دەمێنێتەوە، بۆیە تەنیا پاڵەوانە ڕاستەقینەکانی ڕەگەزی مرۆڤایەتی دەتوانن بەرگەی ئەو گۆشەگیرییە بگرن.

* * * * *

کێشەکان ناتوانن ئێمە تووشی شکست بکەن.

* * * * *

● من سووکایەتیم بە خەڵك کرد، بەرهەمەکانم نەگەیشتنە ئەو ڕادەیەی، کە من بە تەمایان بووم.

* * * * *

● مرۆڤە گەمژەکان و ئەوانە سەرپێی بیردەکەنەوە توورەکەیەکیان بەسە خۆراکەکەیانی تیَ بکەن و دووبارە بێنەوە دەرەوە، چونکە ئەمانە تەنها برێتین لە بۆڕییەکی هەرسکردن.

**(لۆی ڕۆنسۆن) هونەرمەندی ئوسترالیایی**

● یەکەم پیاوی ژندار، کە لە ژیاندا بەختیار بوو بێ، تەنها باوکە ئادەم بوو، چونکە خەسووی نەبوو.

*****

**(لاورین هیل) کچە هونەرمەند و گیتارژەنی ئەمەریکایی**

● ڕاستییەکان دەردەکەون، بەلاَم ئێمە ناتوانین گوێبیستیان ببین، چۆن دەتوانین گوێمان لیَ بێت، لە کاتێکدا ئێمە وا فێر کراوین لە ڕاستی بترسین!.

*****

## پیتی (م)

### محەمەد (د.خ) پێغەمبەری ئیسلام

● زمان لەگەڵ ئەقڵ دا بەکار بێنە و لە سنوور و ئەندازەی ئەقڵ دا قسە بکە.

*****

● بەجۆرێك خێربکە کەس پێی نەزانێت، بۆ ئەوەی ئەو کەسەی خێرەکەی پێدەکەیت هەست بەکەمی نەکات لەناو خەڵکدا.

*****

● ئەگەر کەسێکتان خۆش ویست یاخۆ ڕقتان لێی بوو ئەوا با لە سنوورەکان دەرنەچێت، چونکە مرۆڤ قابیلی گۆڕانە لەوانەیە دۆستی ئەمڕۆ دوژمنی بەیانی بێت و دوژمنی ئەمڕۆ دۆستی بەیانی بێت.

*****

● چاوەکانم خەویان لێ دەکەوێت، بەڵام دڵم هەمیشە بە ئاگایە.

*****

### (مەکیاڤیللی) سیاسەتڤانی ئیتاڵیایی

● پشێوی، زیان بە سەرجەم کۆمەڵگە دەگەیەنێت، لە کاتێك دا ئەو لە سێدارەدانانەی بە فەرمانی میر ئەنجام دەدرێت، تەنیا زیان بە کەمینە دەگەینن.

*****

● ئەگەر داگیرکەرێك وڵاتێکی سەربەخۆی گرت، ئەو کات یاخۆ بە تەواوی وێرانی دەکات، یانیش تێدا دەژێت باجی بەسەردا دەسەپێنێت.

*****

● ڕەوشتمەندی سیاسی، درۆیەکی گەورەیە، چونکە سیاسەت ڕەوشتی نییە!..
● گشت کەس بەو شێوەیە دەتبینێ، کە دەردەکەوی، کەم کەس هەست بەوە دەکەن کە هەی.

*****

● گرینگ نییە کار دەکەی، بەڵکو گرینگ ئەوەیە چۆن کار دەکەی.

*****

● تراژیدیای گەورەی هەر کۆمەڵگەیەك ئەوەیە، سیاسییەکانی هەم چەواشەکار و هەم بازرگان بن.

*****

**(محەمەد حیجازی) سەرۆکی پێشووتری ئەرکانی میسر**

● دایك ئەو دادوەرەیە ئامادەیە، هەموو دنیا سزا بدات لە پێناو منداڵەکانی.

*****

**(محمد ماغوت) چیرۆکنووس و شاعیری سووریایی**

● سیاسییەکان بەر لە دەسەڵات، جووتێك پێڵاون لەپێی خەڵکدا، کە قوونیان گیرکرد لە کورسی، خەڵك دەکەنە جووتێك پێڵاو و دەیانکەنە پێیان.

*****

● ئەگەر نەخۆشخانەکانی خۆمان چاك و بێگەردن، بۆچی (وەزیری تەندروستی) لە دەرەوە چارەسەر دەکرێت؟.

*****

● ئەریێ من نازانم حیکمەتی بەنجکردن چییە لە نەخۆشخانەکانی ولاّتانی عارەبیدا، خۆ ئێمە هەر لە بنەڕەتدا گەلێکی بێهۆشین!..

*****

● هەر عارەبێك لە هەر كات و ساتێكدا بمرێت قازانجیەتی، تاكە شتێك كە لەدەستی دەدات بێ ئەقڵییەكەیەتی.

● هەموو چێشتێكی سیاسی، ئەمەریكا ئامادەی دەكات، ڕووسیا ئاگرەكەی بۆ دەكاتەوە، ئەوروپا خواردنەكە سارد دەكاتەوە، ئیسرائیلیش دەیخوات، عارەبیش قاپەكان دەشوات!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● هەموو ئەو شتەی لەسەر زەوی و لە دەریا و قووڵایی دەریاكانیشە، هی نیشتمانە (نیشتمانیش بۆ چەند دزێكە)!...

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● زۆرێك لە مرۆڤەكان گوو بخۆن قەدرگرانترن، وەك لەوەی ئەوەندە دەم بكەنەوە بۆ قسەكردن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● عارەب بوون، وەك (قەبز)بوون وایە دەبێت زەخت لە خۆت بكەیت تا بتوانی و شەرم نەكەیت بڵێی عارەبم.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● (مار و دەسەڵات و عارەب)، متمانە پێكردنیان لە گەمژەییەوەیە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● زاری ئێمەی عارەب زارێكی قسەكەری بێ كردارە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● هەرگیز نەكەی خۆت بكەی بە هزرڤان و قسەزان، دنیا دنیای خوێڕی و سەرسەریەكانە!...

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● سەرکردەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە گەنجیەوە تا دەگەن بە حەپی ڤیاگرا هەر قوون لە کورسی بەرنادەن.

● (چەپڵە بەدەستێك لێنادرێت) بە جەهەنەم مەگەر تا ئێستە تێر نەبوون لە چەپڵە ؟!.

❋❋❋❋❋

● ئەم کۆمەڵگەیە تەنها گاوانێکی کەمە بەپێش خۆیان بدات و لێیان بخوڕێت، دەنا جلەکانیان لەبەر دابکەنی زۆر ئەستەمە لەگەڵ ئاژەڵان لێکیان جیابکەیەوە.

❋❋❋❋❋

● ئێمە کێشەمان لەگەڵ خودا نییە، بەڵکو کێشەمان لەگەڵ ئەوانە هەیە، کە خۆیان بە خودا دادەنێن.

❋❋❋❋❋

● ئێوە کێن؟ ئێمە عارەبین، چ کارەن؟ ئێمە کارمان نییە، جیهان کار بە ئێمە دەکات.

❋❋❋❋❋

● ڕێز لە بیر و باوەڕی هەموو مرۆڤێك دەگرم، هەر کەسێکیش بێ ڕێزی بە بیر و باوەڕم بکات، کە هەردووك قۆندەرەکانم لە پێم داکەند دەبێت بە نەشتەرگەری لەناو دەمی بهێننەوە دەرێ.

❋❋❋❋❋

● بەدبەختی سەدەی بیست و دوایی سەدەی بیستیش ئەوەیە دەتوانین خوێڕیترین بنیادەمیش لە کۆڕ و سیمینارێك یان لە رۆژنامەیەك بکەین بە فەیلەسووف یان بلیمەتێکی گەورە بەسەر کۆمەڵگەوە و گەمژەیی کۆمەڵگەش لەوەدایە وەك فەیلەسووف و بلیمەت قبوڵیەتی.

❊❊❊❊❊

● رۆشنبیر هیچ شتێکی زیاتر نییە لە کەسێکی ئاسایی، تەنها ئەوەیە رۆشنبیر کەرێتی خۆی باشتر دەبینێت.

❊❊❊❊❊

● نە ژوورێکت پێ بەخشیم ئۆقرەی تیا بگرم، نە ئومێدێ دڵم رۆشن بکاتەوە، ئەی نیشتمان!.

❊❊❊❊❊

**(محەمەد شوکری) رۆماننووسی مەغریبی**

● جیهان پڕە لە دەبەنگی، ئەی من، تۆ بڵێی منیش دەبەنگ بم؟!.

❊❊❊❊❊

● ئیشکردن لەگەڵ کەسە بە تەمەنەکان قورسە، هەمیشە وا خۆیان دەردەخەن، کە هەموو شت دەزانن.

❊❊❊❊❊

**(موسا) پەیامبەری جوولەکان**

●ئامانجێکت هەبێت و هەوڵی بۆ نەدەیت و ئارەزووی ئەوەش بکەیت بێتە دی، وەك ئەوە وایە بتەوێت منداڵێك بەبێ بوونی دایك بێتە دنیاوە.

❊❊❊❊❊

(موعەمەر قەزافی) سەرۆکی پێشووتری لیبیا

● ئومەتی عارەبان بە گشتیی لەناو خۆیاندا لەسەر ئەوە رێککەوتوون، کە هەرگیز رێك نەکەون.

❊❊❊❊❊

● رووخساری جوان هیچ نییە، ئەگەر تۆ دڵێکی جوانت نەبێت.

❊❊❊❊❊

● هۆكاری تەڵاقدان، ژن هێنانە.

❊❊❊❊❊

● ئەو كاتە نەزانین بە كۆتا دێت، كە هەر شتێك بە شێوەی ڕاست خۆی پیشان بدرێت و فێربوونی بۆ هەر مرۆڤێك فەراهەم بكرێت بەو شێوەی بۆی گونجاوە.

❊❊❊❊❊

**(مەولانای ڕۆمی) عاریف و زانا و شاعیری مەزنی ئێران**

● دەتوانیت بە خوێندنەوە فێربیت، بەڵام بە ئەشق لە شتەكان تێدەگەیت.

❊❊❊❊❊

● ئەگەر كەسێكت لە شوێنێك لەدەستدا خەم مەخۆ، لە شوێنێكی دیكە كەسێكی باشتر دەدۆزیتەوە.

❊❊❊❊❊

● دوو باڵندە پێكەوە ببەستەوە ناتوانن بفڕن، هەرچەند چوار باڵیشیان هەیە.

❊❊❊❊❊

● هێندەی ژمارەی ئەو پارە ساختانەی مرۆڤ دروستی كردوون، مرۆڤی ساختەم بینیوە، كە پارە دروستی كردوون.

❊❊❊❊❊

**(مارك تواین) نووسەر و ڕۆماننووسی ئەمەریكایی**

● میهرەبانی زمانێكە، كە كەڕەكان دەیبیستن و كوێرەكان دەیبینن.

❊❊❊❊❊

● ئەو كەسانەی خوێندەواریان هەیە و ناخوێننەوە، هیچ جیاوازییان نییە لەگەڵ ئەو كەسانەی نەخوێندەوارن.

*****

● من حەز ناکەم خۆم بە بەهەشت و دۆزەخەوە سەرقاڵ بکەم، چونکە لە هەردوو بەشەکە، دۆستی باشم هەن!.

*****

● ئەوەی پەڕتووکی چاك ناخوێنێتەوە، جیاوازی نییە لەگەڵ نەخوێندەوار.

*****

● دوورکەوە لەوانەی، کە بەهای ئارەزووەکانت بە کەم دەگرن، مرۆڤی بچووك ئەوە عادەتیتی، بەڵام مرۆڤی مەزن وا دەکات تۆش هەمان تاسەی بەرزی و مەزنیت هەبێت.

*****

● زۆر پێم باشترە ئازار بچێژم بە بیستنی ڕاستی وەك لەوەی هەوڵ بدەن بە درۆ ئاسوودەم بکەن.

*****

● گەوجاندنی خەڵك ئاسانترە لەوەی، کە بڕوایان پێ بهێنی، کە ئەوان گەوجێندراون.

*****

● هەرگیز بەجۆرێك خۆت دەرمەخە، کە هەموو شتێك دەزانیت، چونکە زۆرێك لە پرسیارەکان جگە لە خوا بۆ هەموو کەسێك بێ وەڵامن، کەواتە با تەریق نەبیتەوە بەو جۆرەیە، کە هەیت.

*****

● پرۆسەی ژیان شتێك نییە، جگە لە ململانێ و ئەقڵ.

*****

● تەرك كردنی جگەرە باوەڕ بكەن زۆر ئاسانە، من تا ئێستە زیاتر لە سەد جار وازم لێی هێناوە!.

*****

● ئەگەر سەگێكی برسی تێركەیت و نانی بدەی قەپت لێ ناگرێ و ئازارت نادا، ئەوەش جیاوازی نێوان سەگ و مرۆڤە.

*****

● هەتا ڕاستی پێڵاوەكانی لەپێ دەكات، درۆ خولێكی باش بەدەوری زەویدا لێدەدات.

*****

**(مارتن تێرمن، پزیشك و ڕۆماننووسی ئەمەریكایی**

● كەسانێك كە بە من دەڵێن تۆ دەچی بۆ دۆزەخ و ئێمە دەچینە بەهەشت، من بەختەوەر دەكەن، چون دڵنیا دەبمەوە، كە لەگەڵ ئەوان ناچمە یەك شوێن!...

*****

**(مەحمود دەروێش) شاعیری فەڵەستین**

● پرسە بۆ ئافرەتان بۆنەیەكە، كە تێیدا دڵخۆش دەبن، باشترین جێگەیە تا خشڵ و جلوبەرگەكانی خۆیانی لێ نمایش بكەن.

*****

**(موسا عەنتەر) نووسەر و ڕۆژنامەنووسی كورد**

● خۆزگە زۆرێك لە خەڵكی بەس تەنیا بۆ نان خواردن دەمیان دەكردەوە!.

*****

**(مارسێل ئێمیە) شانۆنامەنووس و ڕۆماننووسی فەرەنسایی**

● گرفتی دارایی تاكە شتە، كە مرۆڤ و ئاژەڵ لەیەك جیا دەكاتەوە.

❊❊❊❊❊

**(مەسعوود محەمەد) نووسەر و هزرڤانیی کورد**

● ئەگەر نووسەر بمرێ، دەمرێ، ئەگەر لە نووسین کەوت دەمرێ، ئەگەر خۆی سووك کرد دەمرێ، ئەگەر ڕای خۆی بفرۆشێ دەمرێ، ئەگەر دووڕوویی کرد دەمرێ، ئەگەر جنێوفرۆش بێ دەمرێ، خۆ ئەگەر لە یەکێ لەمانەدا، جگە لە حاڵەتی یەکەم، نەمرد، دەبێ خوێنەران بیمرێنن.

❊❊❊❊❊

● ژیان چ تامێکی دەمێنێ، کە نەوێریت تێیدا دەنگی دەروونی خۆت بەرزبکەیتەوە

**(ماکس هۆرکهایمەر) فەیلەسووف و کۆمەڵناسی ئەڵمانیایی**

● سەرکردە فاشیستەکان لە پشت دەرگە داخراوەکانەوە بازرگانی بە خاك و ژیانی گەلانەوە دەکەن، لە کاتێکدا جەماوەری سەرمەست بە گوێگرتن لە ڕادیۆ ئەم کردەوانە بەرز دەنرخێنن.

❊❊❊❊❊

**(مارکس) فەیلەسوف و ئابووریناس و کۆمەڵناسیی ئەڵمانیایی**

● ئەوەی لە ڕووی ئابوورییەوە بەرزە، لە ڕووی دەسەڵاتەوەش بەرزە.

❊❊❊❊❊

● ئەو گەلەی گەلێکی دیکە دەپەرستێ، ئەو گەلە کۆت و زنجیر بۆ دەست و پێی خۆی چێ دەکات.

❊❊❊❊❊

● مرۆڤ لە ژیاندا بۆ سێ شت هەوڵ دەدات" دەسەڵات، سێکس و سەرمایە.

❊❊❊❊❊

● ئامانج و مەبەست چەندە پیرۆز بێت، بەڵام نابێت ئێمە ڕێگەی ناڕەوا و چەپەڵیان بۆ بگرینە بەر.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● گەورەکان، تەنها لەو ڕووەوە گەورە دەردەکەون، کاتێك ئێمە کەوتووینەتە سەر ئەژنۆ.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئێمە نەك بەتەنها بەهۆی زیندووەکانەوە، بەڵکو بەهۆی مردووەکانیشەوە ئازار دەکێشین!...

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● هەموو شۆڕشەکان لەسەر دەستی هەژار و پەراوێزخراوەکانی کۆمەڵگەوە هەڵدەگیرسێت، ئەوانەی لە دوورەوەش سەیری شۆڕشەکە دەکەن بەرهەمەکەی دەخۆن و دەبنە خاوەنی هەموو شتێك و سەروەرییەکان بەناوی ئەوانەوە تۆمار دەکرێت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● هەموو بەیانییەك، کە چاوەکانم دەکەمەوە بە خۆم دەڵێم: دەتوانم وا لە خۆم بکەم ئەمڕۆ دڵخۆش بم یان دڵتەنگ بم، دەتوانم هەڵبژێرم کامیان بم، دوێنێ مرد، سبەینێ هێشتە نەهاتووە، تەنها یەك ڕۆژم هەیە (ئەمڕۆ) بۆیە تێیدا دڵخۆش دەبم!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● یاسا یانی کوشتنی هەژاران بە شێوازێکی هێمن، هەرگیز و لەهیچ کوێی دنیادا یاسا لە بەرژەوەندی هەژاراندا نەبووە، کە زۆرینەی هەر کۆمەڵگەیەك پێك دەهێنن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(مونتسکیو) فەیلەسووف و نووسەری فەرەنسایی**

● کتێبێك، کە تۆ دەیخوێنیتەوە نابێت لە جیاتی تۆ بیر بکاتەوە، بەڵکو دەبێ تۆ بەرەو بیرکردنەوە هان بدات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(معین بسیسو) شاعیری فەلەستین**

● سەلاحەدین خۆی کوردبوو، کە سەرکەوت کردیان بە عارەب، ئەگەر دۆڕابایە دەیان وت سەلاحەدین سیخووڕێکی کوردبوو.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(مەکسیم گۆرکی) ڕۆماننووس و شانۆنامەنووسی ڕووسیایی**

● هەرگیز هاوڕێیەتی لە نێوان دوو کەسدا بەردەوام نابێت، کەسێك، کە خۆی بە زیدەتر بزانێ لەوی دیکە و کەسێکیش بنچینەی کەسایەتییەکەی بە تەنها بیرکردنەوە بێت لە مادە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● هەمووان پڕوپاگەندەی برادەرایەتیی دەکەن، بەڵام یەك کەس دەیسەلمێنێ، کە برادەری ڕاستەقینەیە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● چوار جۆر مرۆڤ لە دنیادا هەن، هەندێکیان لە دڵدا شیرین و خۆشەویستن، بەشێکی دیکەشیان سەروکاریان لەگەڵ خەیاڵ و حەز و ئارەزوودایە، هەندێکیشیان حەز بەلاسایی کردنەوە دەکەن، جۆری چوارەمیشیان گێلەکانن، کە لە هەرسێ جۆرەکەی دیکە بەختەوەرترن، دەکرێت بڵێین ژیان هی ئەوانە!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● کاتێك دەسەڵات بە پارە و سامانی میللەتەوە بازرگانی دەکات، دەبێت چاوەڕێی ئەوەی لێ بکرێت لە کاتی مایە پووچیدا میللەتەکەی بە فرۆشتن بدات بۆ هەستانەوەی.

*****

● جەنگی نێوان نەتەوەکان، واتا بێ ئەخلاقی کۆمەڵێك سیاسیی، کە بەرژەوەندییە شەخسیەکانیان کەوتۆتە بەر مەترسی.

*****

● ئەگەر کارکردن شادی بەخش بوو، ئەوا سەرچاوەیەکە بۆ خۆشی، بەڵام کاتێك، کە دەبێتە ئەرك، ئەوا دەگۆڕێت بۆ کۆیلایەتی.

*****

● گەر خەڵکی بیانزانیبا لە پاشەملە چۆن باسی یەکدی دەکەن؟!. دڵنیام چوار هاوڕێ لە جیهاندا پێکەوە نەدەمانەوە.

*****

● هەژارەکان ئەوانە نین، کە دەستیان بە سکیانەوەیە و برسیانە، بەڵکو ئەوانەن کەوا دەزانن شەهادە و رۆشنبیری و زیرەکی" واتە خۆ بەگەورەزانی و دوورکەوتنەوە لە خەڵکی ئاسایی.

*****

● چارەسەرکردنی نەخۆش لە پێناوی پارە خراپترین جۆری تیرۆرکردنی مرۆڤە.

*****

● هەبوونی گەندەڵی و نادادپەروەریی کۆمەڵایەتیی لە هەر وڵاتێکدا، بە واتای گەمژەیی و بێدەنگی ئەو گەلە دێت کە لەو وڵاتەدا دەژین.

*****

● هەموو شتێك لە منداڵییەوە دەست پێدەکات، جگە لە بێ وەفایی!..

* * * * *

**(مەلا مستەفای بارزانی) رابەری نەتەوەیی کورد**

● من لەوە دڵنیام، کە درەنگ یان زوو کورد بە ئامانجی خۆی دەگات و سەردەکەوێت، بەڵام زۆر لەوە دەترسم ئەوانەی خەباتیان کردوو ماندوو بوون لە دوای سەرکەوتن وەلا بندرێن و ئیهمال بکرێن.

* * * * *

● ترسم لەو ڕۆژە هەیە ببینە خاوەنی هەموو شتێکی خۆمان و لە ولاتی خۆمان نەشتوانین خۆمان بەڕێوە بەرین.

* * * * *

● ئێمە ئەگەر ساڵێك یەك بگرین دەیان ساڵ دوژمن بەچۆکدا دەهێنین، بەڵام مخابن هەمیشە بەرژەوەندییە شەخسیەکانمان خستۆتە پێش بەرژەوەندییە گەورەکە، کە بەرژەوەندی گەل و نیشتمانە، ئەوە هۆکاری شکستە یەك لە دوای یەکەکانی شۆڕش و خەباتی ئێمەی کورد بووە.

* * * * *

**(میشکین) ئابووریناسیی ئەمەریکایی**

● بۆ بەرامبەر بە هەست و سۆزەکانتان شەرمەزارن، ئەمە باشترین هەست و سۆزەکانی ئێوەن، ئیتر بۆ لە خستنە ڕوویان شەرم دەکەن؟ دەزانن کە ئێوە تەنیا خۆتان ئازار دەدەن.

* * * * *

**(مارتن لۆسەر کینگ) پیاوی ئاینی و چالاکوانی ئەمەریکایی**

● هەتا سەرت نەوی نەکەی، کەس ناتوانێ سواری ملت بێ.

* * * * *

● تۆ تەنها بەرپرس نیت لەوەی کە دەیڵێیت، بەڵکو بەرپرسیشی لەوەی کە نایڵێیت و لە کاتێکدا پێویست بوو بیڵێیت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئەوەی لە کەسە نیزیکەکانم بینیم بە خەیاڵی دوژمنەکانیشمدا نە دەهات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئێمە دەبێت تێبکۆشین تا ئەو دەمەی، کە منداڵە هەژارێکی برسی لە سەگی دەوڵەمەندێك خواردنی باشتر بخوات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● سەیری هەموو پێپلیکانەکان نەکەیت، تەنها سەیری پێپلیکانەی یەکەم بکە و پاشان پایە بە پایە سەر بکەوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(مەحسون قرمزی گوڵ) هونەرمەندی کورد**

● لە تورکیا ڕێزت دەگرن خۆشیان دەوێی هونەرەکەت بەرز دەنرخێنن، تا ئەو دەمەی نازانن کوردی و ناڵێی کوردم، من کاتێك گوتم فیلمێك لەسەر کارەساتی (هەڵەبجە) بەرهەم دەهێنم گوتیان بۆ؟ گوتم چونکە کوردم و هەست بەئازاری نەتەوەکەم دەکەم، ئیدی لە سەد لاوە تۆمەتیان بۆ دروستکردم و هەموو کارەکانیان ڕاگرتم، (ئەحمەد کایا)م بیرکەوتەوە، کە گوتی ئەو سوکایەتیانەی پێم دەکرێت ئەوە باجی چل ساڵ خزمەتکردنمە بە هونەری تورکان!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(میلان کۆندێرا) نووسەر و ڕۆماننووسی چیك**

● مرۆڤ هەرگیز نازانێ دەبێ چی بووێت، چونکە ژیان جارێك زیاتر نییە و ناکرێ لەگەڵ ژیانەکانی ڕابردوو بەراورد بکرێت، یان لە داهاتوودا هەڵەکانی ڕاست بکرێتەوە.

❊❊❊❊❊

● کەسانێك هەن هیچ هەلێك بۆ لەکەدارکردنی هاوڕێکانیان لە دەست نادەن.

❊❊❊❊❊

**(میشێل فۆکۆ) هزرڤان و نووسەری فەرەنسایی**

● هیچ دیکتاتۆرێك لەپڕ هار نابێت، تاکو تەواو دڵنیا نەبێت لەجێی قوونی و گەمژەیی و دەستەمۆکردنی گەلەکەی.

❊❊❊❊❊

● بۆ زانینی گەمژەیی هەر کۆمەڵگەیەك، سەیری ڕێژەی دەنگدانیان بکە لە هەڵبژاردندا، هەمیشە گەمژەکان لایەنی زۆرینە دەگرن!..

❊❊❊❊❊

● ئەگەر بەنیازی ڕاستی لە سیاسەتمەدارەوە ببیستی، دەبێت هەوڵ بدەی پێشتر خۆت گێل بکەی تا درۆکانی بە ڕاست وەربگریت.!...

❊❊❊❊❊

● ڕەخنەگرتن واتە کارێك بکەین، کە ئەوەی ئەمڕۆ زۆر بە سادەیی و ئاسان ئەنجام دەدرێت، ئیتر بە ئاسانی ئەنجام نەدرێت.

❊❊❊❊❊

## (مسعود بارزانی) سەرۆکی هەرێمی کوردستان

●دەستی هیچ کەس ماچ ناکەم، دایکە شەهید نەبێت، سەر بۆ هیچ کەس دانانوێنم دایکە شەهید نەبێت.

* * * * *

● هەر کاتێك متمانە لە نێوان خەڵك و سیستەمی فەرمانڕەوا دروست بوو ئەو مانایە دەگەیەنێت، کە دەوڵەتی هەق و دادپەورەوەی بەرپابووە.متمانەی هاووڵاتیانیش کاتێك دروست دەبێت، کە هەست بە ئاسایش بکەن و ئەو بڕوایەیان لادروست ببێ، کە یاسا بە بێ جیاوازی لەسەر هەموو کەسێك جێبەجێ دەبێت.

* * * * *

● هەتا سەربەخۆیی دەسەڵاتی دادوەری و سەروەری یاسا نەهێتە دی و سەقامگیری و گەشەپێدان وئینتیما بۆ وڵاتیش دروست نابێت.

* * * * *

● ئەگەر پێشتر کورد دەستی بۆ خەباتی چەکداری بردبێت لە ناچاری بووە و بۆ بەرگریکردن لە مان و ناسنامەی نەتەوەی خۆی. کورد خەباتی چەکدارانەی بە سەردا سەپێنراوە و بە حەزی خۆی دەستی بۆ نەبردووە، نەتەوەی کورد زۆر نەهامەتی بینیوە و هەموو جۆرە چەکێکی لە دژ بەکار هێنراوە، لەبەر ئەوەشە کورد زۆر حەزی لە ژیان و جیهانێکی بەبێ چەکە.

* * * * *

● پێشتر گەنجانی ئێمە نەدەوێران یان پێیان شەرم بوو ئەگەر لە وڵاتێکی دیکە یان شوێنێکی دیکە بیان گوتبا ئێمە کوردین، بەڵام ئەمڕۆ بە سەربەرزیەوە بە سینگ دەرهێنانەوە دەڵێت من کوردم، بۆیە لێرەدا دەبێ سوپاسی خوای گەورە بکەین و بزانین ئەمە لەسایەی خوێنی شەهیدانە.

* * * * *

**(موریس میترلینگ) فەیلەسووف و شاعیر و ڕۆماننووسی بەلژیکیایی**

● ئەگەر مرۆڤ لە بەهەشتیشدا تەنها بێت کاتی لێ ناڕوات، بەڵام ئەگەر کەسێك حەزی لە خوێندنەوە بێت و خۆی پێوە سەرقاڵ بکات، دۆزەخیش بۆ ئەو کەسە باشترین بەهەشتە.

*****

● ئەگەر مێشکی ڤالآ، وەك سکی ڤالآ قۆڕە قۆڕی کردبایە، ئێمەی مرۆڤ زۆر لەوەی ئێستە ئاقڵتر دەبووین.

*****

**(مامۆستا قانع) شاعیری گەورەی کورد**

● ماڵ و حاڵت بۆ چییە، گەر میللەتت لە زیلەت بژی، تاجی سەرشۆڕیت فڕێ بدە، تۆش وەکو میللەت بژی!!..

*****

**(مەحـــوی) شاعیر و عاریفی مەزنی کورد**

● ئەوەی، کە زوو عاجز دەبـێت زوو جێت دەهێڵـێت، زووش دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەوەی، کە درەنگ عاجـز دەبـێت درەنگ جێت دەهێڵێت، ئیتر ناگەڕێتەوە.

*****

**(مریم ئەحمەدی) شاعیری ئێران**

● گەر لە خەونەکانمدا خۆشت دەوێم، لێگەڕێ با بۆ هەمیشە بنووم.

*****

**(مجتەبا سەنعەتی) شاعیری ئێران**

● دڵتەنگی یانی لە بەردەم یەك دەریادا وەستابیت و یادگاری شەقامێك کپت بکاتەوە..

*****

**(مۆزارت) موزیکژەن و ئاوازدانەری کلاسیکی نەمسایی**

● دیداری کەسانێك، کە خۆشتدەوێن، هەمیشە شادی هێنەرە ئەگەر لە خەونیشدا بێت.

❊❊❊❊❊

**(محمد مەهدی جەواهیری) شاعیری گەورەی عێراق**

● کوردەکان لەناو خۆیاندا دوژمنی یەکدین، هەر ئەوەش هۆکارەکەیە، کە دەرفەتی ئەوەیان نییە دوژمنی دوژمنەکانیان بن!..

❊❊❊❊❊

**(مستەر بین) ئەکتەری کۆمیدی بەریتانیایی**

● خەڵك بە قەولی خۆیان بە من پێدەکەنن، بێخەبەرن لەوەی بە ئەقڵیەتی خۆیان پێدەکەنن، چونکە من کار لەسەر گێلی و گەمژەیی کۆمەڵگە دەکەم واتە ئەوان، بەڵام بەشێوازێکی کۆمیدیایی.

❊❊❊❊❊

**(مارکۆس تیولیۆس) فەیلەسووفی ڕۆمانی**

● دوژمنان ڕاستەوخۆ دەتکوژن، بەڵام هاوڕێ هەیە هەموو ڕۆژێك ئازارت دەدات هەتا دەتکوژێ.

❊❊❊❊❊

## پیتی (ن)

### (نیچە) فەیلەسووف و رەخنەگری ئاینیی ئەڵمانیایی

● ئەو کەسەی، کە لە ژیانیدا هەمیشە (بۆچی) هەیە، دەتوانێت بەرگەی هەموو (چۆن)ێك بگرێت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● زینا باشترە، لە چەمینەوە لەژێر باری ژن و مێردایەتیی و درۆی ژن، رۆژێك ژنێك وەهای پێگوتم: ڕاستە، کە من بە زینا بەڵێنیی ژن و مێردایەتییم شکاند، بەڵام ئەمە ژن و مێردایەتیی بوو، کە لە پێشدا منی شکاند!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئەوە ڕاستییەکەیە مرۆڤ بوونەوەرێکی داگیرکەرە و ئەوسەر زەمینە هی ئێمە نییە!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئافرەت وەهمە، ئەوەی بەدوای دا بگەڕێت شێتە!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئەوەندە ڕێزی بەرامبەرەکەت مەگرە، لەخۆی بگۆڕێت و خۆی نەناسێتەوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● هەرچییەکم هەبوو بەخشیم، دارایییەکانم بەخشین، ئاسایشیشم هەروا، ئیتر بێجگە لە تۆ، ئەی ئومێد، هچم بۆ نەماوەتەوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● پیاو لە تەواوی تەمەنیدا دووجار دڵی خۆشە، یەکەمجار کە ژن دەهێنێت و دووەمجار کە ژنەکەی دەمرێت.

*****

● مەزنترین کەس، کەسێکە، کە تەنیاترین کەس بێت!...

● پارێزەرەکان لە پێناو مشتێك پارەدا بە جۆرێك بەرگری لە تاوانبار دەکەن و بۆی دەپارێنەوە زۆرجار دادوەر خۆی بۆ ناگیرێت و دەداتە پرمەی گریان.

*****

● دەترسم ئاژەڵەکان بزانن، مرۆڤ وەك ئەوان ئەقلی لەدەست داوە.

*****

● هەندێ کات مرۆڤەکان نایانەوێت گوێبیستی ڕاستییەکان بن، چونکە حەزناکەن خەون و خەیاڵەکانیان تێکبشکێت.

*****

● مەشرووب بۆ من ژەهرە، ئەگەر پەرداخێ شەراب یان بیرە بخۆمەوە ژیانم لێ دەکات بە دۆزەخ!.

*****

● ئەگەر ئەو ژیانە بە کەڵکی هیچ هاتبایە، نە دەمردین!.

*****

● ژن بەس دەمامك لە دوای دەمامك لای دەبات.

*****

● بەتەمام ئاقڵ بم، چونکە خۆم ئەوەم دەوێت نەك کەسێك داوای ئەوەم لێبکات.

*****

● بزوتنەوەی یەکسانخوازانی ژنان، وا دەکات تا ژن لە تایبەتمەندییە ژنانەکەی دوور بکەوێتەوە !.

*****

● ئەو خەڵکە بۆیە هێندە لەسەر جێبەجێکردنی ئیشوکاریان سوورن، چونکە لەو ڕێگەیەوە لە دەست وەڵامدانەوەی پرسیارە گرینگەکان هەڵدێن.

● زۆرێك لە خەڵکی وا دەزانن ئێمە بۆ ئەوە هاتووینەتە دنیا، تاکو ئەوان بڕوا و ژیان و هەڵسوکەوت و زۆر شتی دیکەشمان بە ئارەزووی خۆیان بۆ دیاری بکەن.

❊❊❊❊❊

● مرۆڤ سەرپشك و مافی هەڵبژاردنی نییە، چونکە مەحکوم و ناچارە بە قبووڵکردنی چارەنووس.

❊❊❊❊❊

● هەندێ مرۆڤ هەن، وەك میوەیەکی گەنیوو و داوەشاوەی شەرالێدراو، دەبنە شوێنی کۆبوونەوەی مێش و مەگەزەکان، پێویستە ڕەشەباکان، لە لێکردنەوەی ئەم میوانە دوودڵ نەبن!.

❊❊❊❊❊

● ڕاستی پێویستی بە ڕاڤەکردن هەیە نەك پێداهەڵدان.

❊❊❊❊❊

● تا ئیرەیت پێنەبرێت و پەلامار نەدرێیت، بەنیازی ئەو ئامانجە مەبە، کە دەتەوێت بی پێکی، هەرگیز تووڕە مەبە و هەڵمەچۆ، کە ناو و ناتۆرەت بەدوو بکەوێت و لێرەو لەوێ بەخراپ باس بکرێیت، ئەوە بزانە تەواوی کەسایەتییە بلیمەتەکان، کە مێژوو لەبیری نەکردن بەو فلتەرانەدا تێپڕیوون، باوەڕت بە خۆت هەبێت و بەرەو ئاسۆ هەنگاو بنێ ئەگەر گوێ بدەی بەو کەسانەی، کە پیشەیان باسکردنی کەسانی دیکەیە و ناشیرینکردنی جوانییەکانە، ئەوا کاتێکت بۆ نامێنێتەوە.

❊❊❊❊❊

● لە دیدی مرۆڤی باڵاوە ئەم کەسانە نەفس نزمن: "شەهوەت پەرستەکان، ئەوانەی هەموو بیر و خەیاڵیان کۆیلەی خەونە سێکسییەکانە، پارە پەرستەکان، ماستاوچییەکان، ڕەشبینەکان، هەوڵدەرانی دەسەڵات و ئەو نووسەرانەی، کە لەبەرخاتری پارە ئامادەن هەموو پوخڵەواتێك بنووسن".

❊❊❊❊❊

● هەرکاتێك چاوت لە خشتەت ببات هەڵی کۆڵە.

● درۆزنی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە لە دژی ویژدانی خۆی قسە دەکات.

❊❊❊❊❊

● چی لەوە گەمژانەترە بەدەستەکانی خۆت پەیکەرێك لە بەرد و تەختە سازبکەی و کڕنووشی بۆ بەری و لە بەری بپاڕێیتەوە؟

❊❊❊❊❊

● فریوی بەهار مەخۆ، هاوین و پایز و زستانێکیش هەیە.

❊❊❊❊❊

●خەڵك تەنیا لەکاتێکدا داوای ئازادی دەکەن، کە هیچ دەسەڵاتێکیان نییە.

❊❊❊❊❊

● مەترسی بەختەوەری لەوەدایە مرۆڤ لەو کاتەدا هەموو چارەنووس و کەسێك قبووڵ دەکات.

❊❊❊❊❊

● مرۆڤ تەنیا گوێ لەو پرسیارانە دەگرێت کە وەڵامەکانی دەزانێت.

❊❊❊❊❊

● هیچ دیاردەیەکی ڕەوشتمەندی بوونی نییە، تەنیا ئێمە بەپێی ڕەوشتمەندی شرۆڤە و خوێندنەوەی بۆ دەکەین.

❊❊❊❊❊

## (ناپلیۆن پۆناپارت) ئیمپراتۆری پێشووی فەرەنسا

● جیهان بەدەست ناخۆشییەوە دەناڵێنێت، بەڵام بەهۆی ئەوە نییە زاڵمەکان زوڵم دەکەن، بەڵکو هۆکاری ئەوەیە خەڵك بێدەنگی هەڵبژاردووە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● گەر هەڵەیەکت کرد، دووبارەی مەکەرەوە گەر دووبارەت کردەوە، دانی پێدا مەنێ، گەر دانت پێدا نا، تکا مەکە گەر تکات کرد، ئیتر مەژی.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ڕۆژنامە گۆشەیەکە لەو گۆشە گرینگانەی، کە کۆڵەگەی شارستانییەت و ئاوەدانی لەسەر دادەمەزرێ.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● داخوازییەکانی ژن لە سنوورێکدا ناوەستن و هەرگیز قەناعەتیشیان نییە، گەر بێت و هەموو گەنجینەکانی سەر زەوی هەبێت، ئەوجا گەنجینەکانی ئاسمانیش داوا دەکات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● شتێك بڵێ، کە بتوانی بینووسیت شتێك بنووسە، کە بتوانی ئیمزای بکەیت شتێکیش ئیمزا بکە، کە بتوانی جێ بەجێی بکەیت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● مرۆڤ لەژێر کاریگەریی هێزی خەیاڵدا، پێشبڕکی دەکات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● سەرکەوتن بەسەر نەزانیدا، گەورەترین سەرکەوتن و خۆشترین سەرکەوتنە، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کات پەشیمانیشی بەدواوە نییە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● دیاری ناپاکیی نەتەوەیی پێشکەش بە سیخوورێك بکە و ئاگەداریشبە، هیچ کات لەگەڵی دامەنیشە و گفتوگۆ مەکە، چونکە تەختی پاشایەتیت دەڕوا.

❊❊❊❊❊

**(نەزار قەبانی) شاعیری گەورەیی سوریایی**

● خۆشەویستیت هەندێك شتی فێرکردم، هەرگیز بە خەیاڵمدا نەدەهاتن.

❊❊❊❊❊

**(نیکۆس کازانتزاکس) ڕۆماننووسی ناوداری یۆنان**

● لە شەوێکی سەرمادا، ناتوانم هەژارەکانی دنیا گەرم بکەمەوە، بەڵام دەتوانم شەوێك بەبێ بەتانی هەست بە سەرما و ساردوسڕی ژیانی ئەوان بکەم!...

❊❊❊❊❊

● مرۆڤەکان هیچمان ئازاد نین، هەموومان پەتێکمان لە ملدایە هی هەندێکمان درێژ و هەندێمانیش کورت.

❊❊❊❊❊

● مرۆڤ ئاژەڵێکە بیر لە ژیان دەکاتەوە.

❊❊❊❊❊

● من لە ژیان و ژن تێناگەم، هەربۆیە هەردووکیان بەبێ کەڵك دەزانم.

❊❊❊❊❊

**(نبال قندس) شاعیر و ڕۆماننووسی فەڵەستین**

● لە تواناماندا هەیە هەمان کەسمان، جارێك، دووجار، سێجار، چوارجار، خۆشبووێت، بەڵام تەنها یەکجار دەتوانین متمانەی پێ بکەین، چونکە متمانە، کە ڕۆیشت ئیدی ناگەڕێتەوە.

❊❊❊❊❊

**(نیلسۆن ماندێلا) سیمبوڵ و سەرۆکی پێشووی ئەفریقای باشوور**

● هەموو بەیانییەك لە ئەفریقا، کە ئاسك لە خەو هەڵدەستێت دەزانێت ئەگەر خێرا ڕانەکات دەبێت بە خۆراکی شێرێك و شێریش دەزانێت خێراتر لە ئاسکەکە ڕانەکات لە برسان دەمرێت ئیدی گرینگ ئەوە نییە، کە شێر بیت یان ئاسك، گرینگ ئەوەیە، کە تۆ بەیانی لە خەو هەستایت ڕابکەیت.

*****

● گەلەکەم پێم دەڵێن: باوکە، ئیدی باوکی باش هەرگیز ناهێڵێت ڕۆڵەکانی برسی بن، بۆیە ئەگەر پێویست بکات هەردووك گورچیلەکانم بۆ ڕۆڵەکانم دەفرۆشم لەگەڵ هەر ئەندامێکی دیکەم، کە پارە بکات.

*****

● بێ ڕەوشترین سەرۆکەکانی دنیا ئەوانەن خەبات و ماندووبونیان بە گەلەکانیان دەفرۆشنەوە و لەسەریان دەکەن بەبار و بە منەت، من ئەگەر سەرکردەیەکیش نەبوایەم وەك هاوولاتییەکی ئاسایی لە پێناو نیشتمانەکەم تێدەکۆشام، ئەوە ئەرکیکی ئەخلاقی نەتەوەییە، من بۆ ئەوە خەباتم نەکرد و ئازارم نەکێشا و زیندانی نەکرام، کە ئازادکرام تا کۆتایی ژیانم سەرۆك بم، پێویستە گەنجەکان بێنە پێش، با خەباتی چەکداریشیان نەکردبێت با لەمەودوا خەباتی شارستانیی بکەن و لەڕێی کورسی دەسەڵاتەوە خزمەت بە گەل و نیشتمان بکەن، من ئەو کورسییە جێدەهێڵم پەیامی خۆم گەیاند و چاوەڕێی پەیامی ئەوانی دیکەم.

*****

● هیچ کەسێك بەو شێوە لە دایك نابێت، کە ڕقی لە کەسانی دیکە بێت بەهۆی ڕەنگی پێستی یان شوێنی لە دایکبوونی یاخۆ بەهۆی ئاینێکی جیاوازترەوە، بەڵکو خەڵکی فێردەکرێن ڕقیان لە یەك بێت، ئەگەر فێربکرێن کینە

و ڕکیان بەرامبەر یەکدی هەبێ، کەواتە زۆر ئاسانە وەهاشیان لێ بکرێ یەکدیان خۆشبوێ، ئیتر بۆ فێری خۆشەویستیان ناکەن.

*****

● ئەو ئامانجانەی تفەنگی بۆ هەڵگیراوە هێشتە نەهاتوونەتەدی، کاتێك بە ئامانجەکانمان گەیشتین، تفەنگەکان خۆیان بێدەنگ دەبن.

● بەزەیم بەو کەسانەدا دێتەوە، کە سەرۆکەکان لە خۆیان بەگەورەتر دەزانن، ئێوە کە منتان خۆش دەوێت وەك هاوڕێیەك سەیرم بکەن یاخۆ وەك خزمەتکار و خزمەتگوزارێك نەك وەك سەرۆکێك، چونکە من لە هیچ کامێك لە ئێوە گەورەتر نیم، تکایە با لە خۆم نەگۆڕێم، چونکە سەرۆکەکان بە پێداهەڵدان ڕۆح زلیان تێدا گەشە دەکات و بیریان نامێنێت خزمەتکارن.

*****

● بۆ ئازادی پێویست نییە زەوی و ئاسمان بکڕن، تەنها خۆتان مەفرۆشن بەسە.

*****

**(نەوال سەعداوی) پزیشك و نووسەری میسری**

● پارچە گۆشتێك لەناو گەڵدا، پیاو هەم خۆی بۆ دەکوژێت، هەمیش لە سەری کەسی دیکە دەکوژێت، لەو نهێنییە تێناگەم!..

*****

● ئەگەر پێت وا بێت ژنێکی تەنوورە کورت بێ ئەخلاقە، واتای ئەوە نییە بێ ئەخلاقە، بەڵکو واتای ئەوەیە تۆ گێلی، کە تێڕوانینت بەو جۆرەیە.

*****

**(نەجیب مەحفوز) ڕۆماننووسی گەورەی میسری**

● هەندێك هەن دەمرن، بەڵام هەرگیز وشەكانیان نامرن، هەندێكیش هەن دەژین، بەڵام هیچ كەسێك گوێ بۆ قسەكانیان ڕاناگرێت.

*****

● مەزنترین كەسیش بیت، مەحاڵە هەموو كەس تۆی خۆش بووێت.

*****

**(نیل سایۆن) ڕۆماننووس و نووسەری شانۆیی ئەمەریكایی**

● مرۆڤەكان لاڵت دەكەن، دوایی لێت دەپرسن، بۆچی قسە ناكەی؟ ئەمە گاڵتەجارترین شانۆنامەی جیهان بوو.

*****

**نوام چۆمسكی( فەیلەسووف و زمانناسی ئەمەریكایی)**

● ئەو سیاسەتمەدارەی دەڵێت درۆم لەگەڵ گەلەكەی خۆم نەكردووە، خودی ئەو قسەیە خۆی، یەكێكە لە درۆ گەورەكانی.

*****

● تەنها شاخەكان دۆست و پەنای كوردن و دۆستەكانی دیكە هەمووی وەهمن.

*****

**(نەزانراو)**

● زۆرینەمان دەخەوین تا خەون بە سەركەوتنەوە ببینین، زۆرینەشمان زوو لە خەو هەڵدەستن بۆ بەدیهێنانی خەونەكانمان.

*****

● هاوڕێکانت خۆشبوێ، بەڵام خوشکەکانیان نا، خوشکەکانت خۆشبوێ، بەڵام هاوڕێکانی نا.

*****

● درۆزنترین کەس لە دنیادا ئەو مامۆستایەیە، کە پرسیاری زۆر قورس دەهێنێتەوە و لە ئاخر دێڕا دەنووسێ (بە هیوای سەرکەوتن)

*****

● کەسی لە خۆبایی ئامادەیە ون بێت، بەڵام پرسیاری رێگە لە کەس نەکات.

*****

● زۆر داوای لێبووردن لەو کەسانە دەکەم، کە منیان بە دڵ نییە.. لە کۆتاییدا من ئەکتەرێکی هێندە شارەزا نیم تا بتوانم دوو ڕووم هەبێت.

*****

● هەموو کەسێکم فەرامۆشکرد تا بە خۆشەویستەکەم بگەم، بێ ئاگام لەوەی کە منیش لەلایەن خۆشەویستەکەمەوە فەرامۆش کرا بووم، تا بە خۆشەویستەکەی بگات.

*****

● ئێمەی مرۆڤ خۆمان هەر خۆش دەوێ، پاش ئەوەی گەلێك هەڵە دەکەین کەواتە چۆن دەتوانین ڕقمان لە مرۆڤەکانی دیکە ببێتەوە لە بەرانبەر هەڵە بچووکەکانیان؟.

*****

● مرۆڤی ژیر پشت بە کارەکانی دەبەستێت، مرۆڤی گێلیش پشت بە خۆزگەکانی دەبەستێت.

*****

● حەز دەکەم سەرێك لە منداڵی بدەمەوە بچمەوە بۆ ئەو سەردەمەی ژیان لە لام هێندەی کۆڵانەکەمان درێژ بوو..

*****

● هەموو دڵتەنگییەك بە ماچێك چاك دەبویەوە، باوکم تەنیا قارەمان بوو، لە لام ئەشق تەنیا لە باوەشی دایکمدا تەواو دەبوو، بەرزترین لووتکەی زەوی شانی باوکم بوو واتای خوداحافیزی تا بەیانی بوو، حەز دەکەم بچمەوە بۆ ئەو کاتە لە دوورەوە سەیری گەورەیی بکەم و بڵێم حەزم لێت نییە!..

*****

● پەڕتووکی ژیان چاپی دووەمی نییە، کەواتە بە خۆشەویستییەوە بژی وەك باڵندە هەڵفڕە بەو شێوەیەی خۆت دەتەوێت ئەگینا هەڵت دەفڕێنن بەو شێوەیەی، کە خۆیان دەیانەوێ.

*****

● خەڵکانێك هەن بە مەبەستێك بەرزت دەکەنەوە، دەیانەوێ لە بەرزترین شوێنەوە بتخەنە خوارەوە.

*****

● ژیان تۆ چوار پیتی، بەڵام بە میلیاران پیتی خۆش و ناخۆشت لە هەناوی خۆتدا هەڵگرتوە..

*****

● کاتێك، کە منداڵ بووم: لەگەڵ خۆشبەختی چاوشارکێمان دەکرد، ئەو خۆی شاردەوە و تا ئێستە نەمدۆزیوەتەوە!.

*****

● ڕۆژانە هەزاران مرۆڤ دێنە دنیاوە، بەڵام ڕەچەڵەکی مرۆڤایەتی خەریکە لەناو دەچێت!!..

*****

● ئەوە لە بیربکە، کە ئازارت دەدات، بەڵام ئەوە لە بیر مەکە کە فێرت دەکات.

*****

● هەموو تووڕەبوونێك نیشانەی ڕق لێبوونەوە نییە، هەروەکو چۆن هەموو خەندەیەکیش نیشانەی خۆشەویستی و هاوڕێیەتی نییە.

*****

● گەورەترین کێشەی هەندێك لە مرۆڤەکان ئەوەیە نە ئەوەندە خوێندەوارن بتوانن قسەی باش بکەن، نە ئەوەندەش هەستیان هەیە بتوانن بێدەنگ بن.

*****

● مرۆڤ نابێت نیگەران بێت بەوەی کەی دەمرێت، چونکە بە دەست خۆی نییە، بەڵام پێویستە نیگەران بێت بۆ ئەوەی کە چۆن بژی، چونکە بەدەست خۆیەتی.

*****

● پەیامێك بۆ دەوڵەمەندەکانی شار، بەسە ئیتر خانووەکانتان ئەوەندە بەرز مەکەنەوە، با هەژارەکان زوو خۆریان لێ ئاوا نەبێ!..

*****

● هەرکاتێك زیاتر لە مرۆڤەکانی ئێستە نێزیك دەبمەوە، زیاتر (تەنیایی) م خۆش دەوێ.

*****

● دڵسافی و باشی گێلی نییە، هونەرێکە نەزانەکان لێی بێ بەشن.

*****

● زۆر جار ئەو کەسانەی، کە بێدەنگن لە چواردەورت و یارمەتیدەرتن، رەنگە هەڵگری خۆشەویستی و ڕاستی زیاتر بن بۆ تۆ لە ئەو کەسانەی، کە بەردەوام بەقسەکانیان بە ئازیز و هاوڕێ ناوت دەبەن، ژیان کردارە نەک تەنها گوفتار.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

● دەوڵەمەندەکان گەر بەدەستیان بووایە، پێکەنینی هەژارەکانیشیان دەکڕی.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

● زۆرجار هیواخوازین خەونەکانمان ببنە ڕاستی، زۆرجاریش بەو هیوایەین ڕاستییەکان تەنها خەون بووایە.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

● با لە بیانو بگەڕێین بۆ لەیەک گەیشتن، نەک لە بیانو بگەڕێین بۆ لەیەک دوور کەوتنەوە.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

● ئافرەت هەموو کات ئافرەتە، بەڵام پیاو هەموو کاتێك 'پیاو' نییە.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

● هەندێ جار پێویستە خۆمان کوێر بکەین لە ئاست هەڵەی ئەو کەسانەی خۆشمان دەوێن، بۆ ئەوەی لە دەستیان نەدەین.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

● خودا ڕوویەکی پێ بەخشیوین تاوانە گەر ڕوویەکی دیکە بۆ خۆمان دروست بکەین.

❋ ❋ ❋ ❋ ❋

● ئەگەر ویستت بەیەکجاری کەسێك بکوژی، وەڵامی مەدەرەوە، وەڵام نەدانەوە، خراپترین جۆری کوشتنە بۆ مرۆڤی ئاقڵ، ئەگەر ویستت ڕێزی کەسێك

بگری بەباشی گوێی لێ بگرە، ئەگەر ویستت هەمووشت لەدەست بدەیت لەگەڵ
هەموو کەس تێکەڵبە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● هەموو کات هەندێك ڕاستی هەیە لە پشت وشەی (گاڵتەم کرد)وە،
هەندێك زانیاریی هەیە لە پشت وشەی (نازانم)وە، هەندێك ئازار و ئەشکەنجە
هەیە لە پشت وشەی (باشە کێشە نییە).

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئەو کەسەی (هەق)ی ناسیبێت بە هیچ شتێك نایگۆڕێتەوە، چونکە شان و
شکۆی (هەق) هێندە بەرز و بڵندە، کە نابێ لە پێناوی هیچ شتێکدا بەخت
بکرێت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● میللەتێك زۆرینەی خەڵکەکەی شەوانە لەسەر شەقامەکاندا ڕۆژبکاتەوە،
کەچی بە کۆشك و باڵەخانەی سیاسییەکانی بڵێت ئەڵا چەند جوانە، ئەو میللەتە
هەر بۆ ئەوە باشن مردنێکی تراژیدیایان هەبێت!.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ڕووی ڕاستەقینەی مرۆڤەکان ئەو شتە نییە، کە بۆ ئێوەی ئاشکرا دەکەن (بە
ئێوەی نیشان دەدەن)، بەڵکو ئەو شتانەیە، کە ناتوانن بۆ ئێوەی ئاشکرا بکەن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئەگەر دەتانەوێت مرۆڤەکان بە جوانی بناسن گوێ ڕامەگرن لەو شتانەی،
کە باسی دەکەن، بەڵکو گوێ بگرن لە ئەو شتانەی، کە بە نەگووتراوی دەیهێڵنەوە
(باسی ناکەن)، بێدەنگی مرۆڤ زۆر لە ڕاستی نێزیکترە تاکو قسەکانی (ئەو
شتانەی دەیلێت).

*****

● هەبوونی پێوەندیی لەگەڵ کەسێك، کە خۆشت ناوێت و نەبوونی پێوەندیی لەگەڵ کەسێك، کە خۆشت دەوێت هەردووکیان پڕە لە ڕەنج و ناخۆشی، بۆیە ئەگەر کەسێکی وەکو خۆمان نەدۆزینەوە باشتر وایە وەکو خودا تەنیا بین.

*****

● لە (خاك)ێك، کە نرخی ژن بە جوانی و نرخی پیاو بە سامانییەوە بێ، هەرگیز بە دوای هۆش و مرۆڤایەتیدا مەگەڕێ.

*****

● بە جۆرێك بەدبەختم!. تەنانەت، سێبەرەکەشم پێچەوانی خۆمەوە ڕێ دەکا..

*****

● گەر کەسێکت خۆشویست زیاتر لەوەی شایستە بوو، ئەوا لە کۆتایی ئازارێکی زۆر دەچێژی زیاتر لەوەی کە شایستەی.

*****

● هەمیشە وا دەزانین ژیانی خەڵکی لە ژیانی ئێمە خۆشترە، خەڵکیش وا دەزانن ژیانی ئێمە لە ژیانی ئەوان خۆشترە، هەمووی لەبەرئەوەیە، کە بڕوامان نەماوە.

● ئەم ژیانە خەونێکی ژیرانەیە، یارییە بۆ (گێلەکان)، کۆمیدییە بۆ (دەوڵەمەندەکان) تراژیدییە بۆ (هەژارەکان).

*****

● گەر هەڵە نەبم ڕێژەی مرۆڤە باش و خراپەکان وەك یەکن لەسەر زەوی، ڕەنگە تەنها یەك کەسایەتیی هەردوو ڕۆڵەکە بگێڕێ.

*****

● ژیان چیرۆك نییە بیگێڕینەوە، شانۆیەکە دەبێت ڕۆڵ بگێڕین.

* * * * *

● کێشەی هزرە داخراوەکان ئەوەیە، کە دەمیان هەردەم کراوەیە...

* * * * *

● ئەگەر کەسێك لە ئاستی تۆدا نەبوو دەست لە ئاستی خۆت مەدە، جێی بهێڵە.

* * * * *

● گرنك نییە تۆ کێیت، شێوەت چۆنە، چی دەپۆشی و چۆن دەژی، گرینگ ئەوەیە تۆ خۆت بیت، وەك خۆت هەڵسوکەوت بکەیت، لەبەر هیچ کەسێك سروشتی خۆت نەگۆڕیت.

* * * * *

● زۆر کەس بە ڕووکار کەم وێنەن، بەڵام کە سەیری ناخیان دەکەیت زۆر لەوە بێ نرخترن، کە مرۆڤ پێشبینیی دەکات !...

* * * * *

● خودا باڵندەکانی خۆش ویست و درەختی بۆ ئەفراندن، مرۆڤ باڵندەکانی خۆش ویست و قەفەسی بۆ سازاندن.

* * * * *

● بەدڵتان بم یان رقتان لێم بـێت، بیرم نایەت بۆ ئەوە لەدایك بووبم تا بە دڵی ئێوە بـجوڵێمەوە.

● دەڵێن نەورۆز حەرامە فریایی خۆمان نەکەوین ماوەیەکی دیکە دەڵێن ژیانیش حەرامە، چونکە مرۆڤ تێیدا تووشی گوناه دەبێت!..

* * * * *

● دڵی پاك هەموو شتێکت پێ دەبەخشێ، لە کاتێکدا خاوەنی هیچ شتێك نییە!.

* * * * *

● پێکەنین،، چیرۆکێکی بێ وشەیە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● باشترین مامۆستا ئەو مامۆستایەیە، کە زانیاری لە دڵیەوە دەبەخشێتە خوێندکارەکانی، نەك تەنها لە ڕێگەی کتێبەکانەوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● لەگەڵ دڕەندەترین گیانلەبەری دنیا میهرەبان بیت، ئەویش میهرەبان دەبێت لەگەڵت، بەس من تێ ناگەم!. بۆچی کاتێك لەگەڵ هەندێك مرۆڤ میهرەبان دەبیت، دەبن بە دڕەندەترین گیان لەبەری دنیا.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● لە سادەیی خۆت بە گومان مەبە، چونکە تەنها شتە سادەکانن دەبنە دیمەنی سەرنجڕاکیش.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● مرۆڤ کەمجار خۆیەتی، کاتێك، کە وەك خۆی دەدوێ، دەمامکێکی بدەرێ، هەموو ڕاستییەکانت پێ دەڵێت، ئیتر ئەوە سروشتی مرۆڤە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ژیانت بە سادەیی بگرە، چونکە بەختەوەرییەکان بۆ لای مرۆڤە سادەکان دەچن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● جیاوازی نێوان ژیان و مامۆستا ئەوەیە: مامۆستا یەکەمجار وانەیەکت فێر دەکات، دواتر تاقی کردنەوەت پێ دەکات، بەڵام ژیان تاقی کردنەوەت پێ دەکات دواتر وانەیەکت فێر دەکات!.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● زۆرینەی خەڵك بە دوای ڕاستییەکانی ژیان ناگەڕێن، بەڵکو بەدوای کەسێك دەگەڕێن، کە هاوڕا بن لەگەڵ خۆیان.

* * * * *

● یاری بە دڵی کەس مەکە، چونکە ڕەنگە یارییەکە ببەیتەوە، بەڵام تا هەتایە کەسێکی دۆڕاوی.

* * * * *

● کەسی ئاقڵ ئەگەر هەڵەیەکی کرد، داوای لێبووردن دەکات، بەڵام کەسی گێل ئەگەر هەڵەیەکی کرد، فەلسەفەی لەسەر لێدەدات.

* * * * *

● مرۆڤەکان هێندە زوو دەگۆڕێن، کە تۆ فریا ناکەویت سەیری کاتژمێرەکەت بکەیت و بزانیت ماوەی نێوان دۆست و دوژمن چەند خولەکە!..

* * * * *

● ئێستە من ڕقم لێت نییە، چونکە ڕق هەستە، تۆش ئەوەندە گەورە نیت هەستت پێ بکەم.

* * * * *

● هەڵبژاردنی ژیان ڕەنگە زۆرجار لەدەستی خۆماندا نەبێت، بەڵام هەڵبژاردنی ڕێگەیی ڕاست لە دەستی خۆماندایە.

* * * * *

● زۆرکات کەسانێك لە دەست دەدەین لە ژیانماندا، نەك لەبەرئەوەی مردوون، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەو خەسڵەتانەیان تێدا نەماوە، کە بە هۆیەوە خۆشمان ویستن.

● کاتێك دەیانەوێ، کە بە هەڵە لێت تێبگەن خۆت ماندوو مەکە بۆ ئەوەی پاساویان بۆ بهێنیتەوە، پشتیان لێبکە و چێژ ببینە لە ژیان.

* * * * *

● هەرگیز باسی تۆیان بۆ ناکەم بۆ ئەوەی هەقی ئەوەیان پێ نەدەم، کە بەشداریم بکەن لە بیرکردنەوەم لە تۆ.

❊❊❊❊❊

● کاتێك ڕاگرتنی هەست و سۆزی خەڵك بگاتە ئاستی ئازاردانی خۆت، لەو کاتە دەبێت بوەستی.

❊❊❊❊❊

● دوو جۆر مرۆڤ کۆمەڵگە تێکدەدەن کەسێك، کە دەزانێ و قسە ناکات، کەسێکیش کە نازانێ و قسە دەکات.

❊❊❊❊❊

● هاوڕێی ساختە وەك دراوی ساختە وایە ئاشکرا نابێت، تا کاتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵی.

❊❊❊❊❊

● ئێمەش سەیرین ها، ڕقمان لە گورگ دەبێتەوە چونکە دڕە، ڕقمان لە پشیلە دەبێتەوە چون سپڵەیە، ڕقمان لە کەمتیار دەبێتەوە چون دزە، ڕقمان لە ڕێوی دەبێتەوە چون فێڵبازە، ئاخر عەزیزم هەر یەك لەمانە لەسەر ئەم شانۆیەن تا بوونی خۆیان بسەلمێنن، ڕێوی تا سەر ئێسقان دەبێ ڕێوی بێت، کەمتیار دەبێ تا ئەبەد دڕەکەی خۆی نمایش بکات، (ئەوە تەنها ئێمەین ناتوانین مرۆڤ بوونی خۆمان بەرجەستە بکەین).

❊❊❊❊❊

## پیتی (هـ)

### (هیتلەر) سەرۆکی حزبی نازی ئەڵمانیایی

● سەرکردە هەرگیز دۆڕاو نییە، ئەگەر لە سەد جەنگیش شکست بێنێ، چونکە هەمیشە کۆمەڵێك گەمژە هەن دوایی بکەون و لەناو کۆمەڵگەدا درۆی بۆ بکەن و شکستەکانی بۆ داپۆشن.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● سامانی سەرکردەکان ئەوەیە تووشیان ببێت بە تووشی میللەتێکی گێلەوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئەو سەرۆکەی کە وڵاتی لەدەست دەچێ و گەلەکەی بە دەستەوە دەمێنێ، دەتوانێ ڕاست بێتەوە، بەڵام ئەو سەرۆکەی گەلەکەی لە دەست دەچێ و وڵاتی لە دەست دەمێنێ هەرگیز ناتوانێ سەربکەوێتەوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● گەورەترین خۆشبەختی سەرۆکەکان لەوە دایە، میللەتەکانیان هەرگیز بیرنەکەنەوە.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● هەرگیز مەکەوە گفتوگۆ و پێشبڕکێ لەگەڵ کەسێك، کە هیچی نییە لە دەستی بدات.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● ئەو کۆبوونەوە نهێنییانەی ژن تێیدا بەشدارە، پێویستە چەند بڵنگدۆیەك لە دەرەوە دابنرێت چون پێویست ناکات خەڵك دوای نیو کاتژمێر کۆبونەوەکە بزانن با گەرماو گەرم بێت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● پێشنیاز دەکەم شەڕ بکەیت، بەڵام هەرگیز خۆشەویستی نەکەیت، چونکە لە شەڕدا یان دەژیت یان دەمریت، بەڵام لە خۆشەویستیدا نە دەژیت و نە دەمریت.

*****

● هەر سەرکردە و فەرمانده‌یەك نهێنییەکانی ڕووبەڕووبوونەوە و باسی جەنگی لای ئافرەت کرد، ئەوە هەر لە سەرەتاوە باوەڕی بە بردنەوە نییە و چاڵ بۆ سەربازەکانی هەڵدەکەنێ.

*****

● فرمێسکیك، کە لە دوای هەر شکستێك دەیڕێژین، هەمان ئەو ئارەقەیە، کە بۆ سەرکەوتنەکانمان ڕشتوومانە!...

وەك هەستی هەر سەرکردەیەکی دیکە، منیش ئەو کەسانەم بە گێل و گەمژە زانیوە، کە بەشان و باڵیاندا گوتوم.

*****

● ئەگەر ژیان بە ئازار و ئێش نەبووایە، بە گریانەوە لە دایك نەدەبووین!...

*****

● جگە لە بەخەبەرهاتن و هۆشیاری خەڵك، هەموو شتێکی دیکەی کۆمەڵگەم پێ جوان و باشە.

*****

● ئەو کەسانەی، کە هیچ کاتێك خۆشیانم نەویست و نەفرەتم لێکردوون جووولەکانن، هەرچەندە ڕێزم هەیە بۆیان، لەگەڵ ئەوەی دەشیانزانی دەسووتێن ئینجا خۆیان دەچوونە نێو فڕنە ئاگرینەکان، بەڵام هیچ کاتێکیش بێ بەرامبەر نەبوونە خزمەتکار.

*****

● خوێڕیترین و هیچ و پووچترین کەس بەرچاوم کەوتبێت، ئەو کەسانەن کە یارمەتیان داوم لە داگیرکردنی وڵاتەکانیاندا.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(هۆمیرۆس) نووسەری داستانی ئەلیادە و ئۆدیسای یۆنان**

● کاتێك پاشا خوا دەناسێت: دادوەری بەرقەرار دەبێت، زەویش گەنم و جۆی دەگرێت و میوەی درەختەکانیش شۆردەبنەوە، دەریاش پڕ دەبێت لە ماسی، مەرەکانیش دەزێن.

**(هەژار موکریانی) شاعیری ناوداری کورد**

● منداڵێکم بەرلەوەی لە دایك بێت دەیگووت: بەو هەموو ئازارەوە بەو هەموو هەڵاتنەوە بەو هەموو ئاوارەیی و بەو هەموو بێ خاکیەوە، تکایە باوکە بە دایکم بڵێ با نەمهێنێتە دنیاوە!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(هۆگۆ چافێز) سەرۆکی کۆچکردووی ڤەنزوێلا**

● وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تەنها کەمێك وشیار ببنەوە، ئەمەریکا سێ ژەم خواردن دەکاتەوە یەك ژەم، نان و سامانی ئەمەریکا لە گەمژەیی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدایە!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

● هەر دەسەڵاتێك لەگەڵ (ئیسرائیل) دا نەبێت درەنگ یان زوو دەڕووخێت، ئەوە پەیامی ئەمەریکایە بۆ هەموو دنی او بەتایبەت وڵاتانی عارەبی !.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(هێدی) شاعیری کورد**

● مردن خۆ یاسای سروشتە، بەڵام نەك بۆ تۆ، کە جێگەت پڕنابێتەوە!..

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

**(هۆشیێ منه) شۆڕشگێڕ و یەکەمین سەرۆکی باکووری ڤێتنام**

● من لایەنگری جەنگ نیم و جەنگیش بەوپەڕی بێ ڕەوشتی و دڕندەگەری دەزانم، بەڵام لە پێناو گەل و خاکەکەم ئامادەم هەم ببمە بێ ڕەوشت و هەمیش دڕندە.

*****

● تووشی سەرسوڕمان مەبە کاتێك دەتەوێت خواردن بدەیت بە باڵندەیەك، بەڵام ئەو هەڵدێت، چونکە باڵندەکان بە پێچەوانەی هەندێك لە مرۆڤەکان، بڕوای تەواویان بەوە هەیە، کە ئازادی لە نان بە نرخترە!.. ئێمە هەموومان هەر دەمرین، دەبا لە پێناو ئازادیدا بێت.

● هەموو دیکتاتۆرەکان، میللەتەکانیان چەکیان دەدەنە دەست و پێیان دەڵێن بفەرموو بۆ کوشتنی ئێمە و ئەوانی دیکە، مەخزەنی چەکی دیکتاتۆر پـڕیەتی لە هاووڵاتی گەمژە.

*****

**(هیگڵ) فەیلەسووفی مەزنی ئەڵمانیایی**

● لە ژیاندا جگە لە ڕەنجدان هیچ شتێکی دیکە دروست نەکراوە، ئەوەی بە دوای خۆشگوزەرانیدا دەگەڕێ بێ ئەقڵترین جۆری مرۆڤە!...

*****

(هەینریش هەینێ) شاعیر و ڕۆژنامەنووسی ئەڵمانیایی

● لەم جیهانەدا، ئەوەندەی گەمژەی لێیە، ئەوەندە مرۆڤی لێ نییە !.

*****

● ژمارەی گەمژەکان لە جیهاندا، لە ژمارەی مرۆڤەکان زیاترە..

*****

(هەمنگوای) نووسەر و ڕۆماننووسی ئەمەریکایی

● هیچ هاوڕێیەك نییە، بە وەفاتر بێت لە کتێب.

❊❊❊❊❊

● هەر کەسێك، لەم دنیایە پێویستە کەسێکی هەبێ، کە قسەی دڵی خۆی بۆ بکات، ئازادانە و بە بێ پەردە و پێچ و پەنا، بە راستی مرۆڤ لە تەنیایی دیق دەکات!..

❊❊❊❊❊

## پیتی (و)

**(وینستۆن چرچڵ) سەرۆك وەزیرانی پێشووتری بەریتانیا**

- کێشەی کۆمەڵگە لەوەدایە هەمووان دەیانەوێت کەسێکی گرینگ بن، بەڵام کەس نایەوێت کەسێکی بەسوود بێت.

*****

- گۆڕستانەکان پڕن لەو گەمژانەی، کە بڕوایان وابوو زەوی بەبێ بوونی ئەوان ناسووڕێتەوە.

*****

- لە یەکێك لە گۆڕستانەکاندا مەزارێکم بینی لەسەر کێلەکەی نووسرابوو: لێرە (پیاوێکی سیاسیی ڕاستگۆی لێیە)، بەلامەوە سەیربوو چۆن دوو کەس لەیەك گۆڕدا دەنێژرێن!..

*****

- ئەگەر ئینگلیز مرد، سیاسەت دەمرێت، ئەگەر ڕووس مرد، ئاشتی دەمرێت، ئەگەر ئەمەریکا مرد، دەوڵەمەندی دەمرێت، ئەگەر ئیتاڵیا مرد، ئیمان دەمرێت، ئەگەر فەرەنسییەکان بمرن، زەوق دەمرێت، ئەگەر ئەڵمانیا بمرێت، هێز دەمرێت، ئەگەر عارەبیش مرد، خیانەت دەمرێت.

*****

- ئەگەر بە ناو دۆزەخیشدا دەڕۆیت، هەر بەردەوامبە لە ڕۆشتن.

*****

- ئەو سیاسی و سەرکردانەم خۆشدەوێت، کە توانایان هەبێت ئامادە بن هەموو دنیا کاول بکەن لە پێناو نیشتمان و گەلەکەی خۆیان.

❊❊❊❊❊

● وەك خۆم حەز بە فێربوون دەکەم، بەڵام هەمیشەش نەفرەتم لەوە کردووە فێرم بکەن.

❊❊❊❊❊

● سێ نەتەوە هەن (ئەفغان و هیند و کورد) هێندە بێگانە پەرستن ئەگەر بتەوێت داگیریان بکەیت پێویستت بەچەك نابێت.

❊❊❊❊❊

**(ودی ئالن) دەرهێنەر و نووسەری شانۆیی ئەمەریکایی**

● هەرگیز کەسێك بەجێ مەهێڵە، کە لە بری جەستەت زیاتر دەستی لە ڕۆحت داوە.

❊❊❊❊❊

● بۆ ئەوەی مرۆڤەکان باشتر بناسیت، تەنها ئەوەندە بەسە یەکجار بە پێچەوانەی ئارەزووەکانیانەوە بجولێنەوە.

❊❊❊❊❊

**(ولیەم رایش) زانا و لێتۆژی دەروناسیی نەمسایی**

● تۆ خۆت سەروەری کۆیلایەتی خۆتی، بە تەنیا خۆشت ڕزگارکەری ئەو کۆیلایەتییەی، چونکە جگە لە خۆت کەسی دیکە بەرپرسیار نییە لە کۆیلایەتییەکەت.

❊❊❊❊❊

**(والت ویتمان) شاعیری ئەمەریکایی**

● هەندێك جار، لە گۆشەیەك دەوەستم و لە ئاپۆرەی خەڵك ورد دەبمەوە، سەرسامییەك دڵم ڕنەك دەدا، کە دەبینم ئەم خەڵکە دوای کەسانێك کەوتوون تۆزقاڵێك چییە، گەلیان خۆشناوێ!..

❋❋❋❋❋

**(ویلیام ڕۆناڵد) نیگارکێشی کەنەدایی**

● سیاسییەکان تەنها لە پێناو مانەوەیان لە پۆستەکانیاندا ئامادەن هەموو شتێك بکەن، تەنانەت ئەگەر ناچاریش بن ببنە نیشتمانپەروەر.

❋❋❋❋❋

**پیتی (ی)**

**(یەڵماز گونەی) دەرهێنەر و نووسەر و ئەکتەری بەناوبانگی کورد**

● ژیان دەرفەتی دڵخۆشبوونی بە ئێمە نەدا !!..

❋❋❋❋❋

● جوانترین سەیرکردن ئەو سەیرکردنەیە، کە لە دووچاوی فرمێسکاوییەوە دێت، کاتێك دەم و زمان دەوەستێت و دڵ قسان دەکات.

❋❋❋❋❋

● سروشت لە هیچ کوێدا نەی وتووە مرۆڤ ناتوانێت بفڕێت، ئەوە ئێمە خۆمانین بڕیارمانداوە نەفڕین.

❋❋❋❋❋

● مردن پۆرت شکاندنێکی ئابڕوو بەرە، بۆ ئەوانەی بەرز دەفڕن و پێیان وایە بەس خۆیان لەسەر زەوی مرۆڤن.

❋❋❋❋❋

● هەرگیز خۆمم بە بچووك نەبینیوە لە بەردەم ئەو بچووکانەی خۆیان بە گەورە دەزانن.

❋❋❋❋❋

● کەسانێکی زۆر هەن تەنانەت لە مردنەکەشمان دەترسێن، بۆیە دەیانەوێت لە دەرەوەی شوێن و جێگەیی خۆمان بنێژرێین ئا ئەمەیە گەورەیی ئێمە کچەکەم.

* * * * *

● چیدی ڕێگە بەخۆم نادەم کورد نەبم، ئەو هەڵاتن و ئازارەم پێ شکۆمەندانەترە وەك لەوەی ناسنامەیەکی تەزویر لە گیرفانمدا بێت، تەنها بۆ ئەوەی بتوانم بژیم، بەس نەبێت باپیرم کورد بوو، نەتانهێشت کورد بێت، بابم کورد بوو نەتانهێشت کوردبێت، من کوردم و دەمەوێت کورد بم.

* * * * *

● پێدەکەنم، چونکە دەزانم پێکەنین، باشترین بەخششە بۆ دۆستەکانم و باشترین چەکیشە بۆ دوژمنەکانم.

* * * * *

● دایکم حەزی دەکرد هەمیشە شانازی بە کوردبوونی خۆمەوە بکەم، بەڵام لەبەر سەلامەتی گیانم دەیگوت کوڕم ئەگەر لێیان پرسی بڵێ تورکم!. بەڵام ئەوانەی لێیان دەپرسیم، ئەوانەش کە لێیان نەدەپرسیم هەر دەمگوت کوردم، ئەوەتا نەك سەر و ڕیشم، ژیانیشمم لەسەر ناسنامەکەم دانا و هەر کوردیشم ئازار هەتا بە ئێشتر بێت باشتر دەتوانی دەنگ هەڵبڕیت و لە هاوار بکەیت!..

* * * * *

● هیچ بەهایەك لەوەدا بەدی ناکەم، ئافرەتێك لەبەر پارە شوو بکات و پیاوێك تەنها لەبەر سێکس ژن بێنێت!..

* * * * *

● کاتێك دادوەر لایەنگری دەسەڵاتە، ئیدی بەبێ هیچ چەشنە تاوانێك هەموو ئەو کەسانەی لە دەرەوەی دەسەڵاتن تاوانبارن.

* * * * *

● پێم دەڵێن تۆ خۆت بە چی دەزانی نیوەی کورد لەگەڵ حکوومەتدایە، دەی منیش دەڵێم من لە نیوەکەی دیکەم، کە خاوەنی شەرەفی نیشتمانن..

* * * * *

● کە ئاشق دەبین واتای ئەوەیە چیدی منداڵ نەماوین و نامانەوێت شەوانە بەبێ بینینی خەونی ترسناك بخەوین، نامانەوێت چیدی بە دەم پیاسەکردنەوە پێبکەنین، ئاشق دەبین، چونکە دەمانەوێت ئازاریش ئەزموون بکەین.

* * * * *

● ئەو دەمەی لە تورکیا دەمخوێند مامۆستایەکمان هەبوو دەیزانی من کوردم ئەگەر بمزانیبا و نەمزانیبا هەر لێی دەدام، ئەوەبوو خوێندنم تەواوکرد، بیستم ئەو مامۆستایەم تووشی شێرپەنجە بووە، داهاتی فیلمێکی خۆمم دا بۆ ئەوەی چارەسەری نەخۆشییەکەی پێ بکات، هاوڕێکانم سەرکۆنەیان دەکردم و دەیانگوت ئاخر بۆ؟، گوتم نە مەسەلە ویژدانە و نە ئینسانەت، تەنها ویستم تەریق بێتەوە و بزانێت کورد دێوەزمە نین و دەتوانن لێبووردە بن.

● کوردبوون سەری ئێمەی خوارد و ئێمەش سەری نیشتمان!..

* * * * *

● چاوەڕوانی سۆز و خۆشەویستی لە کەسانێك مەکە، کە ئازاریان نەچەشتبێ و مەینەتیان نەبینیبێ، سۆز و خۆشەویستی تایبەتمەندیی کەسانێکە کە تاڵی و سوێری ڕۆژگاریان چەشتووە.

* * * * *

● لە ژیانمدا پاشەکەوتم نەبووە، ئەوەی هاتۆتە دەستم بەبێ ژماردن خواردوومە، من دژی لووت بەرزی و خۆ بەزلزانینم، ئەو ڕاستییەش دەزانم سامانی زۆر تووشی ئەو دوو دەردە ناشیرنەم دەکات، بۆیە نامەوێت هەمبێت.

* * * * *

● (دادوەر): تۆ کەسێکی سینەماکار و دەرهێنەری چ کارت داوە بە سیاسەت و پشێوی نانەوە و بانگەشەکردن بۆ نەتەوەیەکی خەیاڵی؟. یەڵماز گونەی:

دادوەری بەڕێز من سیاسیی نیم، بەڵکو لە هەمبەر ناهەقی و نادادپەروەری هاتوومەتە دەنگ و داوای هەموو ئەو شتانە دەکەمەوە، کە زەوت کراون لە میللەتەکەم، (خاك، ئاو، ئازادی و مرۆڤ)، ئیدی سیاسیی ئێوەن، کە منداڵانی حەوت ساڵان دەکوژن و خاکی نەتەوەکانی دیکە داگیردەکەن، سیاسیی ئێوەن، کە بە گریانی دایکانی جەرگ سوتاوو کەیفساز دەبن، سیاسیی ئێوەن، کە فیشەك بە کۆتری ئاشتیشەوە دەنێن، من مرۆڤم، نەك سیاسیی، گرینگیدان و بەرگری لە کۆمەڵگە کاری مرۆڤەکانە، نەك سیاسییەکان.

* * * * *

● ئێمە نەمان توانی دڵخۆشبین، یانی ژیان دەرفەتی خۆشبەختی بە ئێمە ڕەوا نەبینی، ئێمە لە پڕمەی گریانمانداوە نەك لە قاقای پێکەنین.

* * * * *

● زیندانەکانیان پڕکردووە لە کورد و گۆڕستانەکانیان پڕکردووە لە کورد و شین و گریانیان کردووە بە موڵکی کورد، دەشڵێن نابێت بە هاوارەکانتان لە خەو ڕامانبچڵەکێنن!. دەسەڵاتێك ئەوە ڕەوشتی بێت، خەڵك بەزۆر ناچار دەکات هاوارەکانیان بگوازنەوە ناو لوولەی تفەنگەکانیان.

* * * * *

● ئەگەر ئەقڵت کراوە نەبوو، لەهەمانکاتدا دەمیشت لەگەڵی دابخە.

* * * * *

● (دادوەر)ی بەڕێز دەتوانن ئازارم بدەن لێم بدەن و سووکایەتیم پێ بکەن، بەڵام هەرگیز ناتوانن ئەو هەستە ورووژێنەر و جێی شانازییە، کە لە بوونی مندا وەك تەقینەوەی بیرە نەوت بڵێسە دەکات، کە کورد بوونە، لێمی خامۆش بکەن، کاتێك دەتوانم کورد نەبم، کە ئێوە توانیتان حاشا لە تورك بوونی خۆتان بکەن.

* * * * *

● کورد بوون زۆرترین بەرگەگرتنی پێویستە، خۆمان نەبین کەسی دیکە ناتوانێت بەرگەی بگرێت !.

❊❊❊❊❊

● بە پارە شەرەفت مەکڕە، بە شەرەفەوە پارە کۆبکەوە بۆ ئەوەی کە پارەشت نەما هەر بە شەرەفمەندی بمێنیتەوە..

❊❊❊❊❊

# سەرچاوەکان


١/ قوتابخانە فەلسەفییەکان
نووسینی: میهراد میهرین
٢/ جیهانبینی شۆپنهاوەر
نووسینی: میهراد میهرین
٣/ فەلسەفەی دۆستۆڤیسکی
نووسینی: سوزان لی ئەندرسۆن
٤/ مەکیا ڤیللی لەتای تەرازوودا
نووسینی: د. موحسین محەمەد حوسێن
٥/ هەزار ووتە لە ووتەکانی ئیمامی عەلی
کۆ کردنەوەی: صابر صالح حوسێن
٦/ گوڵاڵەکانی ڕۆژگار
کۆکردنەوەی: محەمەد حەسەن مەنگوری
٧/ باوەڕ بەخۆبوون بەشێوەیەکی کاریگەر
نووسینی: پۆل مەکنا
٨/ ووتەکانی نیچە

ئامادەکردنی: موحسین باوەجانی
٩/ لیۆناردۆ داڤینشی
کۆکردنەوەی: ڕەوەند محەمەد جەمیل
١٠/ شۆپنهاوەر و ڕەخنەی عەقلی کانت
نووسینی: ڕامین جیهانبە گلوو
١١/ ساتێک لەگەڵ سوقرات
نووسینی: پۆل ستراتێرن
١٢/ سینۆهە پزیشکی فیرعەون
نووسینی: میگا ڤالّتاری
١٣/ چارەنووسی شومی ئیمپڕاتۆر ناپلیۆن پۆناپارت
نووسینی: پێر نزڵف
١٤/ جیهان لە ڕوانگەی وێناو ئیرادەوە
نووسینی: شۆپنهاوەر
١٥/کتێبی سەوز
نووسینی: معەمەر قەزافی
١٦/ ویکیپیدیای ئازاد
١٧/چۆن هەڵس و کەوت لەگەڵ خەڵکیدا دەکەیت
نووسینی: دیل کارنگی

(شۆپنهاوەر) فەیلەسووفە ڕەشبینەکەی ئەڵمانیا
دەرخستنی ڕاستی ویژدانی ئارام و ڕۆحی ئازاد
و ئیرادەی بەهێزی دەوێ.
ژیان بەدبەختییە، چونکە مرۆڤ بە شێوەیەکی
بەردەوام لە بەردەم مەترسی ڕووداوەکان
و نەخۆشی و مەرگ دایە.
کۆتا چیرۆکی نهێنی ژیان، هەر لەم ئازارەدایە،
کە بەسەر ڕۆژە ڕەشەکاندا هەڵدێت.




خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
MUKIRYANI HOUSE FOR PRINTING AND PUBLISHING
www.Mukiryani.com
2014

بایی ( ٤٠٠٠ ) دینارە